# ئازارەکانی من



پرۆژەی

یەکێتی ژنانی کوردستان

بەشی تەندروستی

ئامادەکردنی توێژینەوە

ئاواز عەبدوڵڵا

سۆران

مهاباد حەمە ڕەزا

ناوی كتێب: **ئازارەكانی من**

پرۆژەی: **یەكێتی ژنانی كوردستان**

ئامادەكردنی: **ئاواز عەبدوڵڵا – سۆران- مهاباد حەمە ڕەزا**

مۆنتاژو بەرگ: **ئومێد محەمەد**

تیراژ: 500

چاپخانە: **تەوار**

چاپی یەكەم 2006

ژمارەی سپاردن (921)ی ساڵی 2006

لەبڵاوكراوەكانی یەكێتی ژنانی كوردستان

زنجیرە-19-

## پێرست- ناوەڕۆك

# سوپاس‌و پێزانین

*خاتوو ڕووناك فەرەج ئاغا لێپرسراوی بەشی تەندروستی یەكێتی ژنانی كوردستان بۆ چاودێری توێژینەوەكەو ڕێكخستنی پەیوەندیەكان لەگەڵ زانایانی ئاینی‌و پزیشكە پسپۆڕەكان.

*دكتۆرە ژیان ئەحمەدو دكتۆر دلێر نوری لەبەڵگەنامە تەندروستییەكاندا هاوكارییان كردین.

*لق‌و كۆمیته‌كانی یه‌كێتی ژنانی كوردستان له‌فۆرمی زانیارییه‌كاندا هاوكارییان كردین.

## پێشەکی

لەکۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتیدا بەهۆی ئینتمای تاکەکانی کۆمەڵ بەگشتیو ژن بەتایبەتی بۆ دابونەریتی کۆمەڵایەتیو ئاینو زاڵێتی دەسەڵاتو عەقڵیەتی پیاوسالارییو بوونی جیاکاریی ڕەگەزیو هەمیشە چەوساندنەوەو توندوتیژیی وایکردووە کە ژن نەتوانێت دەنگێکی ئازادبێتو کاریگەریی هەبێ لەسەر ڕەوشی کۆمەڵگا نەك هەر ئەوەندە, بەڵکو نەیتوانیوە داکۆکی لەمافەکانی خۆی بکاتو خۆی کامڵ بکات لەڕووی کەسێتییەوە، کۆمەڵگای کوردیش یەکێکە لەو کۆمەڵگایانەی کە ژن تیایدا تووشی ئازارو دەردەسەریی بووە, جا ئەمە بەهۆی دینەوەبێت یان بەهۆی دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە, نموونەش بۆ ئەمە خەتەنە یەکێکە لەو دیاردە قێزەونانەی کە دەرهەق بەژنان دەکرێت.

لێکۆڵینەوەو قسەکردن لەسەر دیاردەی خەتەنەکردنی ژن کەمەو لەئاستی پێویستدانییە, بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگە بۆ ئەوەی ژنان هۆشیاربکاتەوە لەزیانەکانی کە هەیەتیو دەرخستنی قەوارەی دیاردەکە لەلای نەوەی کۆنونوێو دەرخستنی هۆکارەکانی سەرهەڵدانو کاریگەرییو زیانەکانی لەسەر کەسێتی ژن وەك توندوتیژیی لەڕووی جەستەییو دەروونییو سێکسییەوە، ڕاستکردنەوەی ئەو بیروڕا هەڵانەی کە بۆ خەتەنە

هەیە لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئایینو سێکسەوە لەم کۆمەڵگایەدا، بۆیە لێکۆڵینەوەکە ژنانو لایەنە بەرپرسەکان ئاگادارەدەکاتەوە لەسەر ترسناکیی بەردەوامبوونی دیاردەکە.

ئەگەرچی دیاردەکە لەچاو ساڵانی ڕابردوودا ڕوو لەکەمی کردووە (ئەمەش مایەی دڵخۆشییە) بەڵام نابێت ئەوەش لەبیربکەین کە دیاردەکە ئێستاش لەنێو کۆمەڵگاکەماندا ماوەو پێویستی بە هەوڵی جدی هەیە بۆ لەناو بردنی بە یەکجارەکی چونکە ئەنجام دانی خەتەنە ئەگەر بۆ تەنهایەك کچو ژنیش بێ ئەوا پیشێلکارییەو ئازاری ئەو کچە دەدرێت.

(( ئازارەکانی من)) هەوڵێکی زانستیە بۆ دەرخستنی قەبارەی دیاردەکەو زیانەکانی کە لەو دوو بەشی سەرەکی پێك دێت ئەوا نیش لایەنی تیۆریو مەیدانیە ، لایەنی تیۆری لەچەند تەوەرێك پێك دێت تەوەرەی یەکەم چوارچێوەی توێژینەوەکەیەو لەتەوەرەی دووەمدا زاراوە پێویستەکانی توێژینەوەکە بەدیار خراوە وە لەتەوەرەی سێیەم دا کورتەیەکی مێژوویو هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دیاردەی خەتەنە لای کچان خراوەتە ڕوو دواتر تەوەرەی چوارەم باس لە کەسێتی ژنو کاریگەری توندوتیژی لەسەر کەسێتی ژن باس دەکات.

دوا تەوەری ئەم بەشە تەرخان کراوە بۆ کاریگەریەکانی خەتەنەکردن لێرەشدا باس لە زیانە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەخۆکان دەکات کە کچانو ژنان تووشی دەبن لە ئەنجامی خەتەنەکردنیانەوە.

بەشی دووەم توێژینەوەکە ش لە چەند تەوەێك پێك هاتووە ، تەوەری یەکەم ڕێوشوێنو میتۆدی لێکۆڵینەوەکە ئاشکرا دەکات تەوەرەی دووەم خستنە ڕووی خشتەکانو لەهەمانکاتدا بەشێوەیەکی سادە ڕاڤەکراوە, هەر لەم تەوەرەشدا گریمانەکان بەدیار خراوە ، تەوەری سێیەم تایبەتە بە سەرنجو پێشنیارەکان دوا تەوەری ئەم بەشەش تەرخان کراوە بۆ دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکەو ئەنجامەگشتیەکانی لە دوایین لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا چەندین وێنەو بەڵگەنامە بەدی دەکەیت کە تایبەتە بە لێکۆڵینەوەکە بەو هیوایەی کە((ئازارەکانی من)) هەوڵێکی باش بێت بۆ ئەوەی کە دیاردەکە بەرەو نەمان بەرێتو هاندەریکێش بێت بۆ کارکردنو نەهێشتنی ئازارەکانی هەموو کچو ژنێك لەم کۆمەڵگایەدا.

بەو هیوایەی لەڕێگەی ئەم کتێبەوە چەمکەکانی خەتەنەکردنی ڕەگەزی مێینە ئاشکرابێ کە تائێستا

بەشاراوەیی ماونەتەوە

## هەوڵەکانی یەکێتی ژنانی کوردستان بۆکەمکردنەوەو قەدەغەکردنی خەتەنەی کچان

یەکێتی ژنانی کوردستان لەسەرەتای کارکردنیەوە بەتوندی دژی هەموو ئەو دیاردەو مەترسیە کۆمەڵایەتیانە وەستاوەتەوە کە هەڕەشە لە ژیانی کچانو ژنانی کوردستان دەکات، دیاردەی خەتەنەکردنی کچانیش وەك یەکێك لەهەرە دیاردە مەترسی دارەکان لەسەر ژیانی تەندروستیو کۆمەڵایەتیو سێکسی کچان یەکێك بووە لەو دیاردانەی کە یەکێتی ژنانی کوردستان لەسەرەتاکانی کارکردنیەوە لەبەرنامەی کاریدا دایناوەو چەندین هەوڵی جیاجیای داوە بەمەبەستی کەمکردنەوەو قەدەغەکردنی ئەو دیاردەیە کە جێی خۆیەتی لە (ئازارەکانی من) دا ئیشارەتیان پێبکەین.

-لەساڵی 1993دا یەکێتی ژنانی کوردستان یاداشتێکی ئاراستەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کردووە دەربارەی خەتەنەکردنی کچانو زەرورەتی نەهیشتنی ئەو دیاردەیە.

-لەساڵی 1993-1996 بەشێوەیەکی بەردەوام لەهەموو شاروشارۆچکەکاندا لەڕێی کۆڕو سیمینارەوە هەوڵی هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵی داوە بۆ ڕێگەگرتن لەو دیاردەیە.

- لەساڵی 1996دا بەشی تەندروستی یەکێتی ژنانی کو ردستان چۆنیەتی قەدەغەکردنی خەتەنەکردنی کچانی خستۆتە پڕ ۆگرامی کارکردنیو بەرنامەی تایبەتی بۆ داڕشتووە لەڕێی ئاگادارکردنەوەو ڕێنمایی کردنی هەموو مامانەکانی شاری سلێمانیو دەوروبەریو چەندین کۆبونەوەی جیاجیا لەگەڵ زانایانی ئاینیو پزیشکی پسپۆڕ بەمەبەستی دەرخستنی لایەنە خراپەکانی ئەو دیاردەیە لەڕووی ئاینیو تەندروستیەوە.

- لەساڵی 2001 داو لەکۆنفرانسی تایبەتی ڕێکخراوی یونسیفدا بۆ کتێبی (ڕاستیەکان بۆ ژیان) لەلایەن نوێنەری یەکێتی ژنانی کوردستان خاتوو (ڕووناك فرح ئاغا)ەوە پێشنیاری زیادکردنی بەشێك بۆ قسەکردن لەسەر دیاردەی خەتەنەکردنو زیانەکانی بۆ سەر ژیانی کچان پێشکەشکراو لەدوایدا بەنوسراوێك ئاراستەی ڕێکخراوی ناوبراو کراو ئەو بڕگەیە بۆ کتێبەکە زیادکرا.

-ساڵی 2004 بەشی تەندروستی یەکێتی ژنانی کوردستان ڕاپرسیەکی لەسلێمانیو هەولێرو گەرمیان بەشێوەی فۆرمی زانیاری لەسەر خەتەنەکردنی کچان ئەنجامداو بەمەبەستی دەستنیشانکردنی قەبارەی دیاردەکەو ئەنجامی ڕاپرسیەکە ئەوەی پیشاندا کە ڕێژەی خەتەنەکردن لەکەمبوندایە بەڵام ڕێژەکە لەجێگایەك بۆ جێگایەکی تر جیاوازی هەیە.

**بەشی تەندروستی**

**یەکێتی ژنانی کوردستان**

# بەشی یەکەم

## لایەنی تیۆری

## تەوەرەی یەکەم

## چوارچێوەی گشتی توێژینەوەکە

گرفتی توێژینەوە.

1- گرنگی توێژینەوە.

2- ئاما نجی توێژینەوە.

3- بواریتوێژینەوە.

## بەشی یەکەم /لایەنی تیۆری

## تەوەرەی یەکەم

## چوارچێوەی گشتی توێژینەوەکە

### 1- گرفتی توێژینەوە.

دیاردەی خەتەنەکردن یەکێکە لەو دیاردانەی کە ئەمرۆ لەکۆمەڵگەی کوردیدا هەستی پێدەکرێت، دیارە بوونی ئەم دیاردەیە لەکۆمەڵگەی کوردیدا لەئەمرۆوە دەستپێناکات, بەڵکو بۆ مێژوویەکی درێژتر دەگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو رەوشە کۆمەڵایەتیو کلتورییەی کە بەدرێژایی مێژوو ئەم کۆمەڵگایەی تیادا ژیاوەو ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەری, بۆیە دەتوانین بڵێین دیاردەی خەتەنەکردنی ژنان دیاردەیەکی توندوتیژییە کە بەرامبەر ژن ئەنجامدەدرێت لەکۆمەڵگاکەماندا بەتایبەتی کە لەبنەڕەتەوە رەگی داکوتاوە, ئەمرۆ بەتەواوەتی هەست بەکاریگەرییەکانی دەکرێت لەسەر بارودۆخی ژن، بێگومان ئەمە بەتەنها توندوتیژیی جەستەیی نییە, بەڵکو توندوتیژیی دەروونییش لەهەمانکاتدا دەگرێتەوە، لەو روانگەیەوەی بۆ لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە بەشێوەیەکی زانستییانە لەسەر بنەمای میتۆدی خوێندنەوەی بابەتی ئەم توێژینەوە لەسەر دیاردەی خەتەنەکردنی ژنان ئەنجامدراوە بەتایبەتی ئەم توێژینەوەیە لەم بوارەدا تازەیەو ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی لەم جۆرەش کارێکی پێویستە, لەگەڵ ئەوەشدا توێژینەوەکە بایەخیداوە بەدیاردەی خەتەنەکردنی ژنانو لێرەوە کۆسپەکان دادەنرێت, یەکێك لەو کۆسپانەی گرفتی سەرەکیی توێژینەوەکە لەوەدا خۆی دەبینێت ئەم دیاردەیە لەلای کۆمەڵگەی ئێمە تاماوەیەکیش دوای ڕاپەرین کەم کەس هەبوون لەبەر هۆکارەکانی (کۆمەڵایەتی، سیاسی, ئاینیی)قسەی لەسەر بکەنو کەمبوون ئەوانەی بوێرانە قسەیان لەسەر خەتەنەدەکرد, بۆیە کەمیی سەرچاوەو زانیاریی لەسەر خەتەنە یەکێکبووە لەئاستەنگەکانی توێژینەوەکە.

پێویستە باسی ئەوەشبکرێت کە هەندێك لەژنان پێیان شەرمە کە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوەو ئەوە ئاشکرا بکەن کە خەتەنەکراون, ئەمەش لەکچانی ئەمرۆدا بەدیدەکرێت, بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە کاتی زۆری ویستووەو لەهەمانکاتدا ئەو کەسانەی کاری خەتەنەیان ئەنجامداوە هەستدەکرا کە ناتوانن زۆر راشکاوانە وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە, ئەویش کاتێك زانییان کە ئەم دیاردەیە کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر ژنان, هەندێ لەمامانەکان راستگۆنین لەوەڵامدانەوەدا, چونکە دەترسن لەوەی تووشی کێشەبن, ئەمەش لەکاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا پێشبینیمان کرد بواری توێژینەوەکە فراوانەو ئاسان نییە ئەو هەموو ناوچەیە تخطیط بکرێت.

## 2- گرنگیی توێژینەوە.

لێکۆڵینەوە لەدیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەك خەتەنەکردن کە زۆرترین زیان لەسەر ژنانو کەسێتییان بەجێدەهێڵێتو لەم روانەوە گرنگە.

یەکەم/ ئەو لێکۆڵینەوانەی تاکو ئێستا لەسەر دیاردەیەکی وەك خەتەنەکردن کراوە کەمەو وەکو پێویست ئاوڕی لێنەدراوەتەوە.

دووەم/ ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ دەرخستنی قەبارەی دیاردەکە لەکۆمەڵگاداو دەرخستنی زیانەکانییەتی لەسەر ژن لەڕووی جەستەیی‌و دەروونییەوە.

سێیەم/ ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکە گرنگیی لێکۆڵینەوەکە زیاتردەردەخات لەسەر دیاردەیەکی وەك خەتەنەکردن لای ژن.

## 3- ئامانجی توێژینەوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتە بەدیاردەی خەتەنە لەسنوری شاری سلێمانی، هەولێر، کەرکوكوخانەقین بۆیە ئامانجەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسنوری ئەم دیاردەیە دەرناچێت.

ئامانجەکانیش بریتین لە:

یەکەم/ زانینی قەبارەی دیاردەکە لەلای ژنانوکچانی نەوەی نوێ بەبەراوردکردنی لەگەڵ ژنانی نەوەی ڕابردوودا.

دووەم/ هۆشیارکردنەوەی ژنانە لەسەر کاریگەرییەکانی خەتەنە لەسەر کەسێتی ژن.

سێیەم/زانینی بۆچوونی ژنانە لەسەر دیاردەی خەتەنەو هەوڵێکە بۆ بەرچاوڕوونیی ڕێکخراوەکانی ژنان بۆئەوەی بەفیعلیی کاربکەن بۆ بنەبڕکردنی دیاردەی خەتەنەی کچان لەکۆمەڵگەی کوردیدا.

چوارەم/ یەکێکی تر لەئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکە دەرکردنی یاسایەکە بۆ قەدەغەکردنی دیاردەی خەتەنە.

## 4- بواری توێژینەوە.

بواری شوێن/ ئەم توێژینەوەیە لەسنوری جوگرافیی پارێزگای (سلێمانی‌و هەولێرو کەرکوكوخانەقین)، لەگەڵ چەند خوێندنگەیەکی ناوشاری سلێمانی (دواناوەندی بەختیاری کچان، دواناوەندی سلێمانی ئێوارانی کچان، خوێندنگەی سلێمانی سەرەتایی، ناوەندی ڕاژانی کچان) ئەنجامدراوە.

بورای مرۆیی/ هەڵبژاردنی نموونەیەکی (1500)کەس لەژنان ، کە (1485) فۆرم شیاوی بەکارهێنان بوو بۆ شیکردنەوەکان, کە ناو خێزانو فەرمانگەو دەرەوەی خێزانی گرتۆتەوە بەئاستە جیاجیاکانی خوێندەواریشەوەو هەڵبژاردنی(100) مامانو (100) کەسی پسپۆڕو شارەزا لەبواری تەندروستیدا.

بواری کات/ توێژینەوەکە لەسەرەتای ساڵی 2006وە دەستکرا بەدابەشکردنی فۆرمەکانو لەدوای سێ مانگ لەلایەنی مەیدانی توێژینەوەکەو داخڵکردنی زانیارییەکانو ئامادەکردنی خشتەکانو شیکردنەوەیان لایەنی تیۆری ئامادەکراو ماوەی توێژینەوەکە (9)مانگ بوو.

www.pertwk.com

# بەشی یەکەم

## تـــــەوەرەی دووەم

## دیـــــاریکـــردنـــی چـــــەمکەکـــــان:-

خــەتـەنەکــردن

- پــــاکیـــزەیـــی فـــیرعـــەونیـــی
- ئــــــایـــن
- دیـــاردەی کـــــۆمـــەڵایەتی
- کـــەســــێتـــی
- تــــونــــــدوتیـــــژیی

**تەوەرەی دووەم/**

**دیاریکردنی چەمکەکان:-**

**خەتەنەکردن:- (Mutilation on Circumihiti)**

بریتییە لەبڕینو لابردنی پارچەیەك لەکۆئەندامی زاوزێی مێینە, لەئاکامیشدا دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی هەستیاریی ورووژاندنی سێکسی. کە ئەو پارچە گۆشتە لەمیتکە Clitoris زۆرجاریش کەمێکی هەردوو (لێو - لچ) بچووکیشی لادەبرێ[1], کەواتە بەشێکی گرنگ کە چێژی سێکسی ئەدات بەرەگەزی مێینەو بەهەڵەو بەبێ ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە بزانن سوودی چییە بۆ جەستەی ئەو ژنەو بەبێ ویستی خۆیان بەهۆی هەردوو هۆکاری کۆمەلآیەتیو ئاینیی لەجەستەی ئەو کچە لادەبرێ.

**جۆرەکانی خەتەنە:**

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیی (WHO) ئاماژە بەبوونی چوارجۆر دەدات بەمشێوەیە[2] :-

جۆری یەکەم" لابردنی بەشێك یان هەموو میتکە ( Clitoris) کە پێی دەوترێت (Clitoridectory)

جۆری دووەم: لابردنی میتکە لەگەڵ لابردنی بەشێك یان هەموو لچی گەورەو بچووك کە پێی دەوترێت (Excision)

جۆری سێیەم" لابردنی هەموو ئەندامی دەرەوەی کۆئەندامی زاوزێ لەگەڵ دورینەوە بەتەواوەتی جگە لەهێشتنەوەی دەرچەی میزو خوێنی سوڕی مانگانە.

جۆری چوارەم: سوکترین جۆریان کە تەنها خۆی لەکونکردنو سمینی ئەندامەکانی زاوزێدا دەبینێتەوە ( Pricking and Piercing)

---

[1] لافازیل هیمەت ڕێبەری خێزانی چاپی دووەم .

[2] د. سامی الذیب، موامرة الصمت، ختان الذکور والاناث ،عندالیهود والمسیحیین والمسلمین الجدل الدیني الطبي الاجتماعي القانوني لا25

**پاكيژەيى فيرعەونى Female Genital Mutilation:-**

جۆرێكە لەزیادەڕەویكردن لەخەتەنەی ژناندا كە لەباشوری سەعیدی میسرو سۆدان پەیڕەودەكرێ, لەم كردارەدا ئەو بەشەی كە دەكەوێتە سەرەوەی پێست لەناوچەی دەرچەی زێو دەوروبەریدا هەر لەمیتكەو هەردوو لچی گەورەو بچووك بەتەواوی لادەبرێتو ناوچەكەی لەباری درێژیدا دەدورێتەوە, بێجگە لە دەرچەیەكی بچووك كە ڕێگە بەهاتنە دەرەوەی میزو خوێنی سوڕی مانگانە دەدات[3], ئەم جۆرە لەخەتەنەكردن كە بەناوی پاكیزەییەوەیە بەتەواوەتی زیادەڕۆیی لەلابردنی بەشێك لەكۆئەندامی زاوزێی مێینە دەكات تاكو ئەو بڕوایەی خۆیان بسەلمێنن كە خەتەنەكردن لەبەر هۆكاری رەوشتیو تەندروستییە.

**ئايين Religion:-**

بەواتا گشتییەكەی راستگۆییو یەكسانیو دادپەروەرییو خۆشەویستیو تەندروستییە بۆ هەموو كەسێك بەژنو پیاوەوە[4], خواوەند جەستەیەكی ڕێكوپێكو بێگەموكورتی بەباشترین شێوە خوڵقاندووە (وخلقنا الانسان من احسن تقويم)[5], ئەو بەشەی كۆئەندامی زاوزێ كە چێژوخۆشی دەدات بەمرۆڤەكان, رێگە نەدریت بەبڕینو لێكردنەوەی چونكە مرۆڤ بەباشترین شێوە دروستكراوە.

د. نوال السعداوی دەڵێت: ئەگەر خوا میتكەی وەك ئەندامێكی هەستیاری سێكسی دروستكردبێت كە تەنها فەرمانی بنەڕەتی هەستكردن بەچێژی سێكسی بێت ئەوە دەگەیەنێت كە خوا چێژی سێكسی بۆ ژنان بەڕەوابینیوەو ئەمەش بەشێكە لەتەندروستی دەروونیی, بەپێی ئەمەش ئەو ژنەی لەچێژی سێكسی بێبەری دەكرێت لەبەشێكی تەندروستی دەروونیش بێبەری دەكرێت، تەندروستی دەروونیی ژن تەواونابێت بەبێ تەواوكردنی چێژە سێكسییەكەی[6] .

---

3 www.arabmedmag.com ختان الاناث والبتر التناسلي للاناث 31-12-2003 لا 32

4 د. نوال السعداوی المراه والصراع النفسی لا65

5 ختان الاناث بين العلم والدين ئنترنيت

6 د.نوال السعداوی. المراه والجنس لا

## دیاردەی کۆمەڵایەتی Social Phenomena:-

چەندین پێناسەی هەیە, یەکێك لەو پێناسانە لەکۆمەڵە رەفتارێکی تاکەکەسیو نەگۆڕ لەشوێنو کاتدا کورت ناکرێتەوە, دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لەخەسڵەتە کۆمەڵی خێزانیو چینایەتیو نەتەوەییەکانەوە سەرچاوەدەگرن [7], بۆیە دیاردەی خەتەنەکردن یەکێکە لەو دیاردە کۆمەڵایەتییانەی کە لەخێزانو نەتەوەیەکەوە سەرچاوەی گرتووەو بڵاوبۆتەوە لەناو نەتەوەکانی تری کۆمەڵگەدا بەپێی داب‌ونەریتی کۆمەڵایەتی ئەو نەتەوانەو کەم تازۆر کاریگەریی راستەوخۆو لاوەکیی هەبووە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵ بەتایبەت ژن.

گرنگترین پێناسە بۆ دیاردەی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە بەڕووداوێك یان شتێکی راستەقینە کە بەچاو دەبینرێتو هەست بەبوونو شوێنەواری دەکەین وەکو (تاوان، جیابوونەوە، جەنگ، خۆپیشاندانو رێپێوانو زۆری دانیشتوان لەشارەکانداو پیسبوونی ژینگە.. هتدو دەتوانرێت پێناسەی بکرێت بەوەی کە دووبارەبوونەوەی رەوشتە لەچەند سیمایەك پێکهاتووە گرنگترینیان (دووبارەبوونەوە، راستەوخۆ, بەزۆر) [8], کەواتە لێرەدا ئەتوانین بڵێین خەتەنەکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەو رووداوێکەو سیفەتی دووبارەبوونەوەی لەکاتو شوێنکەوە بۆ کات‌وشوێنێکی تر دەگۆڕێت, ئەمەش لەکاتێکەوە بۆ کاتێکیترو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکەیە، لەتەمەنە جیاجیاکانی نەوەی کۆن‌ونوێدا ئەم دیاردەیە ڕوویداوەو هەست بەبوونی دەکرێت لەناو کۆمەڵگەدا, هەروەها ئەم دیاردەیە تەنها لەیەك کۆمەڵگەدا نییە, بەڵکو لەزۆربەی کۆمەڵگەکاندا هەیە، لێرەدا ئەوەی ڕوون بێت ئەوەیە کە خەتەنە وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی روونادات بەبێ هیچ هۆیەك, بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری بابەتیو خۆیی کە ئەمەش دەرئەنجامی هەنوکەییو درێژخایەنی هەیە, لەبەرئەوەی خەتەنەکردن دەرئەنجامی هەیە, کەواتە دەبێ رێگەچارەشی هەبێ بۆ دیاریکردنی سنورێك بۆیو زیانەکانی بخرێتە پێش چاو کە پەیوەندیی بەتاکەکانی کۆمەڵەوە هەیە.

---

[7] **محسن ،د.منوچر، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، کۆمەڵێك وەرگێڕ، ڕێبوارسیوەیلی......چاپی یەکەم .هەولێر،**2002 **لا**29

[8] الاستاذ.الدکتور احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع .الدار العربیة للموسوعات الطبعة الاولی 1999 لا367

دیاردەی خەتەنەکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەو زیانی زیاترە بۆ ژنان وەك لەقازانج, لەبنەڕەتدا کارێکی نادروستە .

## **کەسێتی Personality**

تێکەڵێکی ئاڵۆزە لەمیراتی بایۆلۆژیو ژینگەی فیزیکیو ئەزموونی دەستە جەمعییو ئەزموونی تاکانەیی مرۆڤ

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە میراتی بایلۆژیو ئەو ژینگەیەی کە مرۆڤەکەی تیا دەژی کاریگەریی دەخاتە سەر کەسێتی مرۆڤو لەهەمانکاتدا ئەزموونی گروپە کۆمەڵایەتییەکانو ئەزموونی تاکە تاکەی مرۆڤەکان کاریگەریی تەواویان هەیە لەسەر کەسێتی مرۆڤ, بەواتایەکی تر دابونەریتو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەشێکی گرنگی پێکهاتەی کەسێتی مرۆڤن، لەم لێکۆڵینەوەیەشدا کەسێتی ژن مەبەستەو ئەوەش بەدەرنییە لەکاریگەرییە بایلۆژیو کلتوریەکان, ژنیش کە بەکائینێکی نەرمونیان ناسراوە ئەوا کاریگەرییە کلتورییەکان لەسەری زیاتردەبێت.

## **توندوتیژییViolence**

توندوتیژیی وەك مانا، ئەو فشارە دەگەیەنێ کە دەخرێتە سەر رۆحو جەستەی کەسێك، دیارە ئەو فشارەش چەندین شێوازی جیاجیا بەخۆیەوە دەگرێ , لەچەند جۆرێك پێکدێت وەکو (توندوتیژیی کۆمەڵایەتی، توندوتیژیی دەروونیو فیکریی، توندوتیژیی جەستەیی، توندوتیژیی ئابوری، توندوتیژیی جەستەییو تیرۆر)، هەریەك لەجۆرەکانی توندوتیژیی کاریگەریی گەورەی هەیە لەسەر داڕشتنی بناغەی کەسێتی ژن.

---

**پیاچونەوەو دەستکاری پەیمان عزالدین ،ئامادەکردنی یەکێتی ژنانی کوردستان–بەشی تەندروستی لقی سلێمانی. ژن وژیان وگرفتەکانیل24ا**

**محسن،د.منوچر،مقدمات جامعە شناس–چاپ جهاهم،نشردورات،شهران،تابسمان** 1376.**لا** 83

[11] **پەیمان عزالدین .گۆڤاری هزر** 1999**ژمارە** 2 **لا** 15

## تەوەرەی سێیەم/
## کورتەیەك دەربارەی مێژووی خەتەنە

خەتەنەکردنی کچان مێژوویەکی دووورودرێژی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ 200 ساڵ پ. ز, ئەم دیاردەیەش لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا لەناوچەیەکەوە سەریهەڵداوەو لەوێشەوە گوێزراوەتەوە بۆ زۆرێك لەکۆمەڵگاکان، بەگوێرەی زانیارییەکان ئەم دیاردەیە لەناوچە گەرمەکانی ئەفریقادا سەریهەڵداوەو ئەو مەسەلەیە تاڕادەیەك پەیوەندیی بەباری جوگرافیاو سروشتی ناوچەکەوە هەیە.

بەشێوەیەکی فراوانیش لەسەردەمی فیرعەونییەکاندا پەیڕەوکراوەو ژمارەیەکی تر لەکۆمەڵگەی کۆن کە پەیڕەوی دیاردەی خەتەنەیان کردووە وەکو میسرییە کۆنەکان ئەسیوپییەکان, بەڵام فینیقیەکانو سورییەکان دانیان بەوەدا ناوە کە ئەم دیاردەیە لە فیرعەونییەکانەوە وەك داب‌ونەریتێکی کۆمەڵایەتی پەیڕەویانکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا فینیقیەکان بەردەوامنەبوون لەسەر ئەم نەریتە، ئیغریقییە کۆنەکان (هیرودوت) لەکتێبێکدا بەناوی مێژوو دووپاتیدەکاتەوەو ئەڵێت دیاردەی خەتەنەکردن دەستیپێکرد لەناو کۆمەڵانی وادی نیل, ئینجا بڵاوبۆوە لەپێگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە تەشەنەی کردووەو تێکەڵ بەنەریتە کۆمەڵایەتییەکانی گەلان بووە, هەروەها خەتەنەکردن هەبووە لەئەرخەبیل ئەندلوس پێش دەرکەوتنی ئیسلام, بەڵام کە ئیسلام هات چۆنیەتیو شێوەی حوکمەکەی دیاریکردووە .(مورخو هیرودوت) باس لەوە دەکەن لەچەرخی پانزەدا پێش زایین دیاردەی خەتەنەکردنی کچان پەیڕەوکراوە لای فینیقیەکان، ئەسیوپیەکان، میسرییەکانو هۆکارەکەشی نازانرێ[12]. لەسۆدانیش ئەم دیاردەیە تاکو ئەمڕۆش بەردەوامیی هەیە بۆ چاککردنی (الخفاض الفرعونی) خەتەنەکردنی کچانیان کردووە، زاناکان وتویانە کە خەتەنەکردنی کچان لەلای میسرییە کۆنەکان بەلابردنی قیتکەو هەردوو لچی گەورەو بچووك بووەو کاهینێکی میسری لەکتێبەکەیدا کە بەزمانی یۆنانی نووسیویەتی

[12] د.محمود الحاج قاسم محمد ،د. عبدالعزیز الشهوانی 14ه/2001 م الختان تاریخه حکمة الشرعي طرق اجرائه لا 5-6

کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 163 پێش مەسیح کە باسی خەتەنەکردنی کچانی کردووە ئەفسانەیەکی یەهودی هەیە کە نووسەرە عەرەبەکان باسی لێوەدەکەن دەڵێت سارا خەتەنەی هاجەرەی کردووە، یەهودییەکانی کە بەرەگەز حەبەشین خەتەنەکردنیان کردووە تا ئەمرۆ، بەپێی وتەی جمیس بروسی ئسکوتلەندایی لەچەرخی هەژدەدا خەتەنەکردنی کچان لەقودس لەسەردەمی مەلیك سلیماندا بلاوبۆتەوەو پێش چوونیان بۆ حەبەشە پەیرەوی ئەم دیاردەیەیان کردووە, لەلایەکی ترەوە پزیشکانی یەهودی بەبەشداریی پزیشکە رۆژئاواییەکان لەبەریتانیاو ولاتەیەکگرتووەکان بۆ پروپاگەندەکردنی خەتەنەکردنی کچانو پەیرەوکردنی لەسەرەتای چەرخی حەڤدەدا بەتایبەتی لەژێر دروشمی بنەبڕکردنی العاده السریه کە رەهەندێکبوو بۆ بیرکردنەوەی یەهودییەکان[13] , کاسۆلیکەکان لەچەرخی حەڤدەدا لەبەرهۆکاری رەوشتیو تەندروستی نەبووە ئەم دیاردەیان پەیرەوکردووە, بەڵکو ئەوەیان زانیوە کە دابونەریتێکی یەهودییەو بۆیان ماوەتەوە, ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەچەرخی نۆزدەیەمەوەو لەئێستادا بەشێوەی (نطاق ضیق) بەشێوەیەکی فراوان ئەم دیاردەیەیان ئەنجامداوەو مەبەستیش لەمە ئەوەبووە بۆ کەمکردنەوەی کرداری (العادة السرية)و بیرو بۆچوونی ئاینی لای مەسیحییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان نەبووە کە پشتگیریی یان بەرەنگاربوونەوەی خەتەنەکردنی کچان بکەن وەکو ئەوەی کە تایبەتە بەخەتەنەکردنی کوڕان.[14] , بەهۆی کۆچکردنی نێوان ولاتە عەرەبییەکان ئەم دیاردەیە تەشەنەی کردووەو ولاتی عێراقیش کە یەکێکە لەولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستو نەتەوەی کوردیش بەشێکە لەدانیشتوانەکەی ئەم نەریتەی تێدا بلاوبۆتەوە, هەربۆیە بەهۆی پرۆسەی بەئیسلامکردنی ناوچەکەوە زۆرێك لەدابونەریتەکانی ناوچە عەرەبییەکان تێکەڵ بەدابونەریتی کورد بووە, بۆیە پێدەچێت دیاردەی خەتەنە لەکاتی بەئیسلامبوونی کۆمەڵگەی کوردییەوە هاتبێت, لەگەڵ ئەوەشدا لەتورکیاو ئێران لەئاینو دابونەریتیاندا ئەم دیاردەیە پەیرەو ناکەن لەگەڵ ئەوەی ئەم دوو ولاتە ولاتی ئیسلامین, سەبارەت بەکوردستانیش لەهەندێ ناوچەدا ئەم دیاردەیە پەیرەو ناکرێتو لەهەندێ لەگوندەکانی ناوچەی پێنجوێن ئەم دیاردەیە بوونی نییە چونکە پەیوەندیی بەجوگرافیای ناوچەکەیانەوە هەیە, لەبەرئەوەی ناوچەی پێنجوێن ساردبووە ئەم دیاردەیە پەیرەونەکراوەو بەپێچەوانەی ناوچەی گەرمیان کە گەرمەو بوونی ئەم دیاردەیە

---

[13] د. سامی الذیب، موأمرة الصمت، ختان الذكور والاناث ،عندالیهود والمسیحیین والمسلمین الجدل الدیني الطبي الاجتماعي القانوني لا 98

[14] **سەرچاوەی پێشوو** لا76- 77د. سامی الذیب، موأمرة الصمت، ختان الذكور والاناث ،عندالیهود والمسیحیین والمسلمین الجدل الدیني الطبي الاجتماعي القانوني لا 98

تائێستاش هەیە, لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك لەو هۆکارانەی کە بۆتەهۆی ڕازیکردنی ژنی کورد بەخەتەنەکردن ئەوەیە ئەگەر خەتەنە نەکرێت ئەوا نانو ئاوی دەستی حەرامە.

هەروەها بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك شێواز بەکارهاتووە بۆ ئەنجامدانی ئەم دیاردەیە بەبێ بەکارهێنانی ماددەی سڕکەرو بێهۆشکەرو ئەو ئامرازانەش کە زیاتر بەکاریانهێناوە گوێزان، چەقۆ، یان کەتەری تیژ یان مەقەست بەکارهاتووە, لەکوردستاندا دیاردەی خەتەنەکردن لەوەرزی بەهارو هاویندا کراوە بەو بڕوایەی کە زیاتر وەرزێکی فێنکەو بەهار خوێن جمانەو زوو برینی ئەو کچە چاکدەبێتەوە .

**-هۆکارەکانی سەرهەڵدانی خەتەنە.**

## 1- کۆمەڵایەتی:

کۆمەڵگە کە پێکدێت لەو کۆمەڵە خێزانو خەڵکانەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی،و دابونەریتو کلتورێکی هاوبەشیان هەیە, کۆمەڵگەی کوردیش یەکێکە لەو کۆمەڵگایانەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تیایدا بەهێزەو لەڕێگەی ئەمەشەوە مرۆڤ لەم کۆمەڵگایەوە ناچاردەبێت کە ئینتیمای زۆری هەبێ بۆ دەوروبەری خۆیو گوێڕایەڵبێت بۆ مرۆڤەکانی دەوروبەری، لەکۆمەڵگەی ئێمەدا هیچ شتێك تاك بڕیاری لێنادات، بەڵکو دابونەریت لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئایینەوە دووهۆکاری سەرەکینو دەبنەهۆی کۆنترۆڵکردنی بیروهزری تاکەکانی کۆمەڵ, لەهەمانکاتدا کۆمەڵگای کوردی کۆمەڵگەیەکی باوکسالارەو هەردەم لەخەمی ئابڕوی خێزانو بنەماڵەدابووە, بۆیە ژن بەبەردەوامیی چاودێریکراوەو هەوڵدراوە هەر لەمناڵییەوە بەشێوەیەك لەشێوەکان حەزو ئارەزووەکانی کۆنترۆڵو کپ بکرێتەوە, یەکێك لەو شێوانە خەتەنەکردنی کچان بووە بەو بڕوایەی زەمانەتی پاکیزەییو ڕەوشت بەرزییو بەوەفایی ژن دەکات بەرامبەر پیاو کە خیانەتی لێناکاتو شەرەفی دەپارێزێو تووشی لادانی سێکسی نابێت, ئاراستەی بیرکردنەوەی (ف.ك) ئەوەیە ژن چۆن دەبێ خەتەنەنەکرێت؟ خەتەنەکردن شەرەفمان دەپارێزێ, لێرەدا مەبەستێکی تری پەیڕەوکردنی خەتەنەکردن بۆ ئەوەبووە کە گوایە ژن لەکەیەو بێعارەو ئەتوانرێت لەلایەن زاڵێتی دەسەڵاتی پیاو لەکۆمەڵگەدا بەهۆی خەتەنەکردنەوە پەردەپۆشی بکات ئەویش بەبەمەبەستی پاراستنی ئابڕووی بنەماڵەو نەریتی کۆمەڵایەتیو کلتوری, بەو بڕوایەی ناتوانرێ پارێزگاریی لەکچێنی ژن بکرێت هەتا خەتەنە نەکرێت, نموونەش بۆ ئەمە ئەوەتا خاتوو نورهان مامۆستایەکی تورکمانەو دانیشتوی کفری-یە لەگەڵ ئەوەی کە لای خۆیان ئەم نەریتە نییە بەڵام پێیوایە خەتەنە هەر هیچ نەبێ کچەکانمان لەهەوەسی سەرشێتانەی قۆناغی هەرزەکاریی دووردەخاتەوەو

ئەگەر وانەبێ ژن کەفوکوڵ ناچاری دەکات پەنا بباتە بەر زیناکردن[15] , لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەم کۆمەڵگەیەدا ژنان زیاتر لەپیاو پێویست بووە پەیڕەوی دابونەریت بکات، کاتێکیش دیاردەی خەتەنە لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا تێکەڵ بەدابونەریتمان دەبێ ئەوا ژنی کورد پێویستبوو ئەرکێکی تر جێبەجێبکات کە پەیڕەوکردنی ئەم دیاردەیەیە, لەبەر بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی نەك زەرورەتی تەندروستی خەتەنە کە لێکردنەوەی بەشێك لەئەندامی زاوزێی مێینەیە ئەنجامدەدرێت.

کەواتە هەموو چینوتوێژەکانی کۆمەڵ لێی بەدەرنینو ناکرێت ئەم مەسەلەیە یاخود دیاردەیە بەکێشەی رەگەزی نێر بەتەنها یان رەگەزی مێ باسی لێوەبکرێت, چونکە گەر هەردوو رەگەز لەچینی رۆشنبیراندابنو ئاستی رۆشنبیرییان بەرزیش بێت لەکۆمەڵگایەکدا دەژین کە باوکسالارییەو خاوەنی کلتورو ئاینێکی چەسپاوو رەگ داکوتانی ئەو فیکرە کۆنەپەرستانەیە وایکردووە ئەم دیاردەیە بیانگرێتەوەو بێبەش نەبن لەزیانەکانی خەتەنەکردن.

دەرئەنجامەکانی خەتەنە لەسەر کەسێتی ژن وایکردووە ژنێکی بێدەنگو شەرمنو کەم ئارەزوو دروستبکات, بۆیە جارێکی تر ئارەزووی پیاوی بۆ پیادەکردنو سووربوون لەسەر پەیڕەوکردنی دیاردەکە لەلای ژنی کورد دوبارەکردۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا خەتەنە وەك دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی پیرۆزیی خۆی رادەگرێتو پیادەکردنی دەخاتە ئەستۆی تاکەکانی کۆمەڵ.

د. سهام دەڵێ: ژن وا پەروەردە دەبێت کە شەرمە ژن ئازارەکانی بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بەسێکسەوە هەیە رابگەیەنێت، لەبەرئەوەی ژنان ئەم ئازارە رەتدەکەنەوە جا ئەگەر ئەو ئازارەبێت کە پێیدا تێپەڕبوون لەکاتی شێواندنی جەستەیان یان ئەوەبێت کە بەهۆی ئەو شێواندنەوە ژیانی ژنومێر پێوەی دەناڵێنن ئەوەی بەسەر خۆیاندا هاتووە بەسەر کچەکانیاندا دووبارەی دەکەنەوە[16] .

تەنها لایەنی زانستییە کە دانپێدانی لەڕووی تەندروستییەوە خەتەنەکردن بەزیان دەخاتەڕوو کە دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی وروژاندنی سێکسو نەگەیشتنی بەئورگازم, لەبەرامبەردا لەڕووی کۆمەڵایەتەوە تاکەکانی کۆمەڵ بەهۆی نەزانینو کەمیی ئاستی رۆشنبیرییان خەتەنەکردنی کچان بەپاکیزەییو دورکەوتنەوە لەکاری خراپ دەزانینو لاوازی سێکسی تاکو ئێستاش لەهزریاندا رەنگدانەوەی هەیەو بەدیدەکرێت.

---

[15] **رۆژنامەی ژیانەوەسالی دەیەم ژمارە** (735 ) 2 /7/ 2006 **لا** 4

[16] **لەیلا علی. گوناهەکانی ژن بوون و ستەمەکانی جەستە لا** 10-11-12

هەربۆیە ژنە بەتەمەنەکان هەموو کات لەخەمی خەتەنەکردنی کچەکانیانو هەولیِ جێبەجێکردنی ئەم کارە دەدەن, ئەوەتا ئەگەر لەشوێنێك مامان یان دکتۆر ئەم کارە نەکات ئەوا ژنان خۆیان ئەم کارە جێبەجێدەکەن, بۆئەوەی لەبەرامبەردا رێزیان لەلایەن خێزانو کۆمەڵەوە دەستبکەوێت. نموونەی ئەمەش کچێکی تەمەن حەوت ساڵانە کە شکات لەدایکی دەکات چونکە ویستویەتی خەتەنەی بکات, کەواتە ئەم دیاردەیە بەهۆکاری کۆمەڵایەتی چەسپاوە نەك بەویستی تاکەکانی کۆمەڵگە!.

هەربۆیە هۆکاری کۆمەڵایەتی بەیەکێك لەهۆکارە گرنگەکان دادەنێین بۆ بڵاوبوونەوەو بەردەوامبوونی دیاردەکە لەکۆمەڵگەی کوردیدا.

## 2- سێکس

تەنها هۆکارێکی کاریگەر لەسەرەتاوە کە بۆتەهۆی پەیرەوکردنی خەتەنە لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتدا هۆکاری سێکسە, ئەمەش بۆ ئەوەیە کە حەزوئارەزووە سێکسییەکانی ژن کەمبکرێتەوەو دواتر بەئاسانی کۆنترۆڵبکرێت, چونکە میتکە هەروەك زانراوە زۆرترین هەستە سێکسییەکانی تیاکۆبۆتەوەو بڕینی ئەم بەشەش وا دەکات کە بەشێکی زۆری هەستە سێکسییەکانی ژن لەناوبچیِو نەتوانێت بەشێوەیەکی سروشتی ئەو حەزوئارەزووەی دەبێتەهۆی ئەوەی لەکرداری سێکسدا چێژ وەرنەگرێتو نەگات بەلوتکەی ئۆرجازمو ئەو ئارەزووە سێکسییانە پیادەبکات.

ئەو بیروبۆچوونانە کە بەناوی چاککردنو رێکخستنی ژیانی سێکسی کچانەوە پێی هەڵدەستن ئەم بیروباوەڕانە کە بەبڕینی ئەو پارچە گۆشتە سێکس بنەبڕدەکاتو لەهەڵەکانی سێکس دووریدەخاتەوە دەبێتەهۆی ئەوەی چێژ لەسێکس وەرنەگرێتو نەگات بەلوتکەی ئۆرجازم[17], بەگوێرەی زانیارییەکان ئەم دیاردەیە لەناوچە گەرمەکانی ئەفریقادا سەریهەڵداوە, چونکە ناوچە گەرمەکان لەشیان گەورەتردەبێتو ئەو پارچە پێستەش لەڕادەی سروشتی خۆی زیاتردەبێت.

دەگێڕنەوە لەو ناوچانەدا ژنەکان کاتێك سواری حوشتردەبوون دەبووەهۆی وروژاندنی سێکس بۆیە باشترین شت بەبیریاندا هاتووە بۆ رێگرتن لەوە خەتەنەکردن بووە، بەو بڕوایەی کە دەبێتەهۆی کۆنترۆڵکردنو دیاریکردنی ئارەزووی سێکسی کچان یان لەوەوە سەرچاوەدەگرێت رێگەگرتنە لەغەریزەو حەزە سروشتییەکانی ژنان, خەتەنە کە بڕینی بەشێکی هەستیاری ئەندامی زاوزێی مێینەیەو دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی ئارەزووی سێکس ئەوا زەرورەتی پەیڕەوکردنی دیاردەکەی سەلماندووە, بۆیە بەبەردەوام پیاوی کورد لەخەمی خەتەنەکردنی ئافرەتەکانداوبووە بۆئەوەی هەر لەسەرەتاوە زەمانەتی ئابڕووی خۆیو بنەماڵەکەی بکات.

لەم حاڵەتەدا ژن هەست بەخۆشی سێکسی ناکات, بەڵکو دەچێتە ژێر رکێفی حەزو ئارەزووی پیاوەوە, ئەمەش خۆی لەخۆیدا رێنەکەوتنە لەگەڵ راستییە بایالۆژییەکانی توانای سێکسی ژن، ئەو توانایەی کە لەزانستی بایالۆژی تازەدا دەریدەخات بە(توندوتیژو بازنەییەو بەردەوامە)و پیاو نەیتوانیوە خێزانی باوکسالارو

---

[17] فازیل هیمەت رێبەری خێزانی چاپی دووەم لا

کلتوری نێرینە دروستبکات تەنها لەڕێگەی پیادەکردنی توندوتیژییو بنەبڕکردنی توانای سێکسی هەستیارەوە (خەتەنەکردنی کچان بەسادەترین شێوە)یان دامرکاندنەوەی سێکس بەسەر ژندا سەپێنراوە لەچەرخە مێژووە جیاوازەکانداو هەتا ئەمڕۆ دەسەڵاتی نێرینەو قەدەغەکراوەکانو سنوربەزاندن بەتەنها لەسەر ژنانە[18].

یەکێك لەهۆکارە ئەندامیو دیارەکانی ساردیی سێکس بریتییە لەخەتەنەکردنی کچان لەمناڵیدا کە لەداهاتوودا تووشی ساردیی سێکس دەبن[19]. بۆیە پیاوی کورد هەر لەسەرەتاوە هاوسەرەکانیان هاندەدەن بۆ خەتەنەکردنی کچەکانیان لەمناڵیداو لەقۆناغی هەرزەکاریدا تاکو کۆنترۆڵی ئارەزووە سێکسییەکانی کچەکانیان بکەن, لێرەوە ئەتوانین بڵێین کە خەتەنەکردنی کچان هۆکارێك بووە بۆ بەرەوا نەبینینی ژنان بەحەزە سروشتییەکانیان کە یەکێك لەوانە غەریزەی تێربوونی سێکس وەك مافێکی سروشتی هەموو زیندەوەرێکە نەك بەتەنها ژن ، بەڵام بەهۆی خەتەنەکردنەوە سنوری بۆ دانراوە.

فرۆیدو هاوبیرانی تووشی سەرسوڕمان بوون کاتێك بۆیان دەرکەوت هەندێك لەژنە پێگەیشتوەکان لەدیدی ئەواندا ساردن لەکرداری سێکسداو تەنها قیتکە ئەبێتە شوێنی هەستیاریی سێکس لای ژنان, بۆیە هیچ چارەیەکیان بۆ ئەم سەرسوڕمانە نەدۆزیەوە تەنها ئەوەنەبێت کە قیتکە وەك ئەندامی نێرینەیە، لەبەرئەوەی ئەندامێکە چالاکیی سێکسی هەیە, ئەم چالاکییە سێکسییە سیفەتێکی نێرینەیەو لەوانەیە ئەمە یەکێکبێت لەو هۆکارانەی کە لەکۆنەوە بۆلابردنی قیتکە لەجەستەی کچان لابراوە (لەهەندێك کۆمەڵگەی کۆنو کۆمەڵگەی عەرەبی تا ئەمڕۆ)پەیڕەودەکرێت لەپێناو پاکیزەیی مێینە لەم ئەندامە چالاکە بۆئەوەی چالاکیی سێکس مافێکی تایبەت بێت بەڕەگەزی نێر[20].

## 3- ئاین

ئەگەر ئاین ڕاستگۆییو یەکسانییو دادپەروەرییو خۆشەویستیو تەندروستی بێت بۆ مرۆڤەکان ئەوا ناکرێت پاکانە بۆ ئاین بهێنرێتەوە بۆ ئازاردانی مرۆڤەکان, بەڵام زۆرجار بەهۆی کەسانی شوێنکەوتووی ئاینەکانەوە یان بەهۆی دابونەریتی کۆنی کۆمەڵگاکانەوە تیکەڵەیەك لەدابونەریتو بیروباروەڕە کۆنەکان تێکەڵ بەدین دەبێت, ئەمانەش وا دەکات کە تاکەکانی کۆمەڵگا بەئاسانی نەتوانن دابونەریتو بابەتە دینییەکان جیابکەنەوە لەیەکتریی، ئاینیش کاتێك لەنێو بیروباوەڕی تاکەکاندا بەهێزدەبێ ئەوا زۆر قورسە تاکەکانی کۆمەڵگا بیروباوەڕە جیاوازەکان لێك جیابکاتەوە، بۆیە کاتێك دیاردەی وەك خەتەنە کە بیانووی دینی بۆ دەهێنرێتەوە ئەوا ئاسان نییە کە تاکەکان خۆیان لەو دابونەریتە قوتاربکەن, چونکە هۆکاری دینی کاریگەرترینو بەهێزترین هۆکارە بۆ بەدیاردە بوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان, ئەو بیروبۆچوونانەی کۆمەڵگە

---

[18] د.نوال السعداوى،المراءة والجنس، الانثى هي الأصل لا93

[19] عايدة احمد الرواجية ،البرودوالضعف الجنسي علاجه بالطب العربي والحديث لا15

[20] د.نوال السعداوى،المراءة والجنس، الانثى هي الأصل لا95

که وای دادەنێن دیاردەی خەتەنەکردنی کچان بەکەڵکە بەمەبەستی راستکردنەوەی چەند رووییەکی تێکچووی ژنان لەڕووی کۆمەڵایەتی‌و ئاینەوە.

لێرەدا هەوڵدەدەین کە بیروباوەڕی ئاینی ئیسلام بەرامبەر بەخەتەنەکردنی ژنان ڕوونبکەینەوە بۆئەوەی بزانین تاکو چەندە خەتەنەکردنی کچان فەرزە یان سوننەتە لەلایەن دینەوە, هەروەها بەرامبەر بوونی ئەو بنەما شەرعیانەیە کە کۆشش کەرانی ئیسلام حوکمی پێئەکەن.

(دکتۆر شوقی الفنجری) لەکتێبەکەیدا لەسەر خەتەنەکردن بەم خاڵانە بنەما شەرعییەکانی کورتکردۆتەوە:

نابێت هیچ شەریعەیەك یان بنەمایەکی شەرعی لە فەرموودەیەکی لاوازەوە وەربگیرێت، لەبەرئەوەی واتای فەرموودەی لاواز یان بەدرۆ ئەخرێتەوە یان بۆ مەبەستێکی تایبەتییە.

ئەگەر زانایەکی پزیشکی‌و زانایەکی ئایینی لەسەر بابەتێکی زانستی ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەبوو ئەوا بۆچونی پزیشکەکە کاری پێدەکرێت لەبەرئەوەی شارەزاییی‌و پەیبردنی لەپسپۆڕییەکەی خۆیدا زیاترە.

لەشەریعەتدا بنەمایەك هەیە (نەزیان بەخشین‌و نەزیان لێکەوتن) واتای ئەوەیە کە هەر بابەتێك زیانی بۆ مسوڵمانان هەبێت بەپێی بۆچوونی شارەزایانی بوارەکە ئەبێت ئەو پرۆژەیە وازی لێبێنیت.

دوای ئەمانە دێینە سەر ئەو سونەتانەی کە لایەنگرانی خەتەنەکردن‌و پارێزەرانی وەك بەڵگە بەکاریان دێنین بۆ سەلماندنی بروبیانوەکانیان, بۆیە وەڵامیان دەدەینەوە لەڕێگەی رەتکردنەوەی پیاوانی ئایینی بۆ بۆچوونەکانیان‌و ئەو فەرمودانەی کە پشتیان پێبەستووە، ئەویش ئەوە دەسەلمێنێت کە لەڕاستیدا ئەوان بەرگریی لەهەڵوێستی دواکەوتوویان بەرامبەر بەچن‌و بەستنەوەیان بەکەلتورو نەریتە شیاوەکانەوە دەکەن نەوەك بەرگریی لەناوەڕۆك‌و مەبەستەکانی ئایین.

پێش چوونە ناو بابەتی فەرمودەکان‌و روونکردنەوەی راستیەکان پرسیارێکی زۆر ئاسانی ژیرانە ئەکرێت، ئایا پێغەمبەر(د.خ) کچەکانی خەتەنەکردبوو؟ ئەگەر خەتەنەی کردبێت ئەوا لایەنگرانی خەتەنەکردن گرەویان بردۆتەوەو بەڵگەی یەکلاکەرەوەیان لایە!! بەڵام سەیرەکە لەوەدایە وەڵامەکە نەرێییەو پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی نەکردووەو ئەم پرسیارە سەرەڕای روونییی‌و ئاسانی لایەنگرانی بیریان لێنەکردۆتەوە, وەڵامی شێخ عەبدولڕەحمان نەجار بۆ ئەم پرسیارە لە کتێبەکەیدا (موقف الاسلام) هەڵوێستی ئیسلام ئەوەیە کە دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) چوار کچی هەبووەو لەسەرگوزشتەکەیدا باسی خەتەنەکردن نەکراوە, ئەمە بۆیە لەپێش‌و لەناو ووردەکاری فەرموودەکانەوە باسکرد بۆئەوەی بڵێم کە ژیاننامەکە (السیرە النبویە) پشتگیریم دەکات ئێمە خۆمان فرێ ئەدەینە دونیای قوڵی مشتومڕەوەو پێغەمبەر(د.خ) ئەم کۆششەی بۆ تەواوکردوین کە سەرگوزشتە بۆندارەکەی خۆی بەڵام بۆئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان تەواوبکەین لایەنگرانی خەتەنەکردن کە مێشکیان

شۆراوەتەوە بەئاگابێنینەوەو لەپێشدا ئەو فەرموودانە باسبکەین کە پشتی پێدەبەستین ئینجا وەڵامیان لەئەنجامی کۆششی پیاوانی ئایینی رۆشنبیردا بدەینەوە.

فەرموودەی یەکەم ( الختان سنة الرجال ومكرمة للنساء) ،ئەم فەرموودەیە حجاج بن ارطاء ریوایەتی کردووەو قرتبی بن حجر دەڵێت (الحجاج ليس ممن يحتج به) واتە حجاج ئەوە نییە کە بەبەڵگە بهێنرێتەوە.

فەرموودەی دووەم کە بەچەند شێوازێك هاتووە یەکێك لەوانە (اذا التقى او مس او جاوز الختان الختان فقد وجب الغسل).

فەرموودەی سێیەم کە بەناوبانگترینیانە لایەنگرانی خەتەنەکردن زۆر بەکاریانهێناوەو گێڕانەوەکانی سەبارەت بەژنێکە کە کەنیزەکانی خەتەنەکردووە، گێڕانەوەی یەکەم بەبێ ناوهێنانی ژنەکەیە یان ناوهێنانی ام عطيه ام حبيبه، ام ايمن لەفەرمودەیەکی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی گرتووە کە ژنێك لەمەدینە هەبووە بەناوی (ام عطيه) ئەم ژنە سوونەتی بۆ ژنان کردووە، پێغەمبەر پێی فەرمووە (ياأم عطيه اخفضي ولا تنهكي فانه انظر للوجه واحظى عند الزوج) لەریوایەتێکی تردا پێغەمبەر دەفەرموێت (لاتنهكي فان ذلك أحظى للمرأة وأحب الى البعل) واتای حەدیسەکانیش ئەوەیە کە پێغەمبەر نەهی کردووە زۆری لێبڕێتو فەرمویەتی بۆ ژنوپیاو مانەوەی باشترە نەك برینی بەتەواوی, بروانە کتێبی "تاج الاصول-بەرگی/3 لاپەرە 171"

هەموو ئەو فەرمودانەو توانجی زانایانو زانایانی ئاینی کۆنمان خستەڕوو کە باسی خەتەنەکردن دەکەن، بەڵام ئایا زانانی ئاینی (الفقهاء)کانی ئەم سەردەمە چیان دەربارەی ئەم فەرموودانە ووتووە؟

ئەوەی پەیوەندیی بەفەرمودەی یەکەمەوە هەبێت سليم العوا دەڵێت (ئەم دەقە بە بەڵگە دانانرێت لەبەرئەوەی دەقێکی لاوازە، ئەگەرێتەوە بۆ گێڕەرەوەیەك کە جێگەی بروا نییە، کەواتە چۆن بریارێکی شەرعی (یاسایی) لێوەربگیرێتو بەسونەت یان بە پیرۆز دابنرێت، یان هیچ نەبێت کردارێکی ئارەزووکراوبێت لەکاتێکدا ئارەزووکردن بریارێکی شەرعییەو بەبەڵگەیەکی راست نەبێت ناسەلمێت)و فەرموودەی ناوبردنی (الختانين) العوا باسی لێوە دەکات (هیچ بەڵگەیەك لەم فەرموودەدا لەسەر ئەم بابەتە نییە, لەبەرئەوە زاراوەکە لێرەدا لەناونانی دوو شتەوە هاتووە بەناوێکی بەناوبانگتر لێیان, یان بەناوێك بۆئەوەی ئەویتری پێبناسرێتو لەعەرەبیدا زاراوەی لەم بابەتە زۆرە، وەك العمران (ابوبكرو عمر) القمران (الشمس والقمر) والعشاوان (العشاء والمغرب)... هتد.

زاراوەی دوو خەتەنە (الختانين) هیچ بەڵگەیەکی لەسەر بەشەرعیەتدان بەخەتەنەکردنی ژنان تێدا نییەو فەرموودەکە لەبنچینەدا دەربارەی شتنە (الغسل )نەوەك خەتەنەکردن. **(بروانە بەڵگەنامەکان لەکۆتایی ئەم کتێبەدا)**

دێینە سەر بەناوبانگترین فەرموودە کە ئەویش فەرموودەی کۆتاییە:

العوا دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت (فەرموودەی ام عتیە بەهەموو رێگاکانیەوە نەخێری تیایەو نەبەڵگەیەکە کە کەڵکی لێوەرگیرێتو ئەگەر بەڕاست بزانرێت ئەوا ئەو رێنماییەی کە تیایدا هاتووە فەرمانی خەتەنەکردن ناگرێتەوە, بەڵکو چۆنیەتییەکەی دیاریدەکات لەکاتی روودانیدا ( من ئەتوانم ئەو داوایەی کە د.العوا مەبەستێتی روونی بکەمەوە, ئەگەر من فەرمان بکەم بەسەر نەخۆشێکمدا کە جگەرە خواردن کەمبکاتەوە لەدووپاکەتەوە تەنها بۆ پێنج جگەرە, ئایا ئەمە واتای ئەوەیە کە من فەرمانم بەخواردنی جگەرەکردبێت؟ یان من لەگەڵ نەریتێکی باودا رۆشتوومو ئەمەوێت هەنگاو بەهەنگاو کەمی بکەمەوە).

لەسەر ئەم واتایە (ئەنوەر احمد) لەکتێبەکەیدا (رای زانایانی ئایینی) دەڵێت ئەوەی کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر(د.خ), لەوانەیە وای بەبیردابێت کە پێغەمبەر(د.خ) نەیویستووە نەریتێك قەدەغەبکات کە عەرەبەکان لەسەری رۆشتوونو لەدەروونیاندا رەگی داکوتاوە, بەڵکو ویستویەتی کە زیادەڕەویەکەی کەمبکاتەوەو سنور بۆ زیانەکانی دابنێت, لەبەرئەوە بەشێوەیەکی بەخشندەو بەسۆزەوە رێنمایی خەتەنەکەرەکەی کردووە.

العوا فەرموودەی(ام حبیبە)ی بەڕاست دانەناوەو دەربارەی ئەمە دەڵێت (ئەم فەرموودەیە لەکتێبی (السنە)دا نییەو باسی ژنێکی بەو ناوەی تێدا نییە کە بەو کارەی هەستابێت, ئەو قسانەیان هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە بەڵکو هیچ بناغەیەکیشی نییە).

ئیمام شلتوت لەتێبینیەکەیدا لەسەر هەموو فەرموودەکان لەفەتواکانی ساڵی (1959)دا دەڵێت (لەنمایشی گێڕانەوەکان سەبارەت بەخەتەنەکردن ئەوەمان بۆ روون ئەبێتەوە کە هیچ راستییەکی تێدا نییە تاوەکو بەڵگە بێت بۆ (السنە الفقهی) سونەتی ئاینزانی سەرەڕای بوونی زانایانی ئاینی, ئەمەش ئەو ئەنجامەیە کە هەندێك لەزانایانی پێشوو پێی گەیشتوون.

لەدەربڕینەکەیدا دەردەکەوێت کە هیچ سەرچاوەیەك یان سوونەتێك نییە کە راستی خەتەنەکردن دەربخاتو وشەی (سوننەت) کە لەهەندێك لەگێڕانەوەکانیاندا واتای ئەوەیە کە (رێگەیەکی باو بەپێی کات بەڕاست دابنرێت)و ئەم وشەیە لەسەر زمانی پێغەمبەر(د.خ) بەو واتا ئاینییە نەهاتوو کە لەدوایدا پێی ناسرا.

ئەوەی کەئاشکرایە دەسەڵاتی شەرع ملکەچی دەقێکی گواستراوە نابێت, بەڵکو بناغەیەکی گشتی شەرعی بۆ نێرینەومێینەش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئازاردانی زیندەوەر بەشێوەیەکی شەرعی نەگونجاوە ئەگەر لەبەرژەوەندی کەسەکەدا نەبێتو بەرژەوەندیی لەئازارەکەدا نەبێت.

دکتۆر (سید رزق الطویل ) راگری کۆلێژی (دراسات لاسلامی) لەو کاتەدا هاوڕابووە لەگەڵ رایەکەی پێشوودا، هەروەها دکتۆر طنطاوی پشتگیریی لێکردووەو بەرپەرچی فەتواکەی (جاد الحق)ی داوەتەوە کە دەڵێت (من

سەرم سوڕماوە لەو قسانەی کە هەڕەشەی شەڕکردن لەو دێیە دەکات کە پەیوەست نەبێت بەکرداری خەتەنەکردنەوە), ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە لەگەڵ هەموو دنیادا بجەنگێین جگە لەمیسرو سودان!! لەزانایانی دەرەوەی میسر کە ئەسپی خۆیان لە مەیدانەکەدا تاوداوە ( شێخ عبدالغفار منصور )راوێژکاری (الفقه الاسلامی)یە لەمەککەی پیرۆز, لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە لەکۆنگرەی دانیشتوان لەقاهیرە خوێندیەوە وتی (ئێمە لەمەککە نە لەپێش لەدایکبوونی پێغەمبەر د.خ نەلەدوای پەیامەکەشی ئەم نەریتی خەتەنەکردنەمان نەبووەو پێغەمبەر د.خ هیچ کچێکی خۆی خەتەنەنەکردوەو تائێستا نەریتی خەتەنەکردنی کچان لەمەککەدا نەناسراوە)[21].

هۆکاری ئاین کاریگەریی زۆر لەسەر بڵاوبوونەوەی دیاردەکە کەسانێك کە پلەوپایەیەکی ئاینی هەبێ‌و ئەگەر هەڵەش بێت ئەوا خەڵکانێکی زۆر پەیڕەویدەکەن, چونکە لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا نەخوێندەوار زۆرەو ئەو جۆرە کەسانەش قسەی مەلاو پیاوانی ئایینی کاریگەریی زۆرە لەسەری، ئەگەرچی لای ئێمە تاکو ئێستا مشتومڕێکی ئەوەندە دیارو زەق نەبووە لەسەر ئەم دیاردەیە بۆ ئەوەی قسەیەکی یەکلاکەرەوە بکرێت، نەك هەرئەوەش بەڵکو ئێستاش پیاوانی ئاینی لەلای خۆمان خەڵك هاندەدەن بۆ کردنوپەیڕەوکردنی دیاردەیەکی قێزەونی وەك خەتەنەکردن, نمونەش بۆ ئەمە قسەکانی (مەلا محەمەد ئەمین)ی سەرۆکی زانایانی ئاینی کوردستان-لقی گەرمیانە کە لەبەدواداچوونێکی( ژیانەوە)دا بۆ ئەم دیاردەیە دەڵێت (کێشەکە لێرەدایە کە ئەم مامۆستا بەڕێزە پێیوایە ژنان ئەگەر خەتەنە نەکەن گوناحیان ناگات, بەڵام کردنی بەشتێکی باش دەزانێت‌و پێیوایە لەفەساد دوریاندەخاتەوەو لەهەمانکاتدا دەڵێت کەسانی  پسپۆڕ ئەم کارە ئەنجامبدەن, چونکە ئەگەر بەشێکی زۆری لابرێت تووشی ساردی سێکسی دەبێ‌و کێشەی هاوسەرییان بۆ دروستدەبێت کە ئەمەش مومکینە لەکاتی کردارەکەدا زۆر برین رووبدات, بۆیە ئەو ژنە تا مردن کێشەی بۆ دروستدەبێت بەداخەوە زانایانی ئاینی لای خۆمان کەمتر گوێبیستی گفتوگۆکانی شارەزایانی ئاین دەبن کە لەوڵاتە عەرەبییەکان دەکرێت‌و لەهەمانکاتدا گوێ بەلایەنی تەندروستی‌و لایەنی دەروونیی ژنان نادەن.

دەتوانین ئەوەش بڵێین کە مانەوەی دیاردەیەکی وا ترسناك لەکۆمەڵگای ئێمەدا بۆ هاندەری پیاوانی ئاینی لەم شێوەیە دەگەڕێتەوە, ئەگەرچی ئێمە لەسەرەوە باسی ئەو بەڵگانەمان کردووە کە لایەنگرانی خەتەنە بەسونەتی دەزانن‌و هەوڵدەدرێت ئەنجامبدرێت کە ئەویش راستی تیدا نەبوو, بەڵام بەڵگەکانی (1) * رای یەکێتی زانایانی ئیسلامی لەکوردستان ئەگەرچی ئەوانیش بەسوننەتی دەزانن بەڵام لەهەمانکاتدا لەنێو کۆمەڵگەی ئێمەدا ئەوەی کە باوە وەك نانی دەستی حەرامەو نوێژی دروست نییە بەهۆی خەتەنەوە لەهەمانکاتدا

[21] الختان والدين،قراءة دينية للختان،الاتفاقية الأمريكية لحقوق الانسان www.wfrt.net

پێشیانوایە پەیڕەونەکردنی ئەم سونەتە گوناح نییە, بۆیە گرنگە ژنان تەندروستی خۆیانو کچەکانیان لا گرنگ بێتو هیچ کات بیر لەشتێك نەکەنەوە کە زیانی هەیە بۆیان.

لەکۆتایدا دەتوانین بگەینە ئەو راستییەی کە خەتەنەکردنی کچان (تەنها کێشەیەکی تەندروستی یان ئایینی یان کۆمەڵایەتی نییە, بەڵکو کێشەی هەموویانەو گفتوگۆکردن لەسەر یەکێکیان بەتەنیا شێوە فڕوفێڵێکە)[22] لەبەرئەوەی خەتەنەکردن بەلابردنی ئەو پارچەیەی کۆئەندامی زاوزێ پێناسەدەکرێتو لەڕووی تەندروستییەوە کاریگەریی خراپ لەسەر جەستەو دەروونی ژن بەجێدێڵێتو لەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە جگە لەتێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان ژنوپیاو هەروەها لەڕووی ئایینییەوە هیچ زیانێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت بەتاکەکانی کۆمەڵ، دەبێت ویستی ئەو کەسانە بوەستێنرێت کە سورن لەسەر پەیڕوکردنی ئەم دیاردەیە بەهەر هۆیەکبێت.

22 لیلی عەلی. گوناهەکانی ژن بوون و ستەمەکانی جەستە لا7

*بۆ بینینی بەڵگەی ژمارە (1) بڕوانە بەڵگەنامەکان لەکۆتایی ئەم کتێبەدا

**تەوەرەی چوارەم/**

**کەسێتی ژن:-**

بەباسکردنی قۆناغەکانی تەمەنی کچ کە لەئەنجامی کارلێکردنی گۆڕانە جەستەییەکانو فسیۆلۆجیەکان بەسەرجەستەدا دێن لەگەڵ فاکتەرە کلتوریو کۆمەڵایەتییەکاندا کاریگەریی گەورە لەسەر داڕشتنی کەسێتی ژن هەیە، کچە لەتەمەنی هەرزەیدا گەورەترین فشاری کۆمەڵایەتی ژیانی ئالۆزو ناخۆشدەکەن ئەمەش وا دەکات کەسێتییەکی لاوازی هەبێت, چونکە ریگەنادرێت متمانە بۆ خودی خۆیو دەروبەری دروستبکات، دیاردەی خەتەنە کاریگەرییو کاردانەوەی سلبی لەسەر کەسێتی ژن دروستکردووە کە دەبێتەهۆی شاردنەوەی حەزو ئارەزووەکانیو هەستەکانی.

بەپێی کەسێتی داڕێژراو لەقۆناغی منالییو لەسەرەتای فامکردنی منداڵ بەدەوروبەریو باکگراوندی پەروەردەو شێوازی ژیانو ئاستی وشیاریی خێزانەکەی ئەو گوشارانە لەچەندەها شێوەدا خۆی دەبینێتەوە, یەکێك لەوانە کچ لەقۆناغی هەرزەکاریدا وەك منداڵ سەیردەکرێتو مافی قسەکردنی نییەو قسەکانی لێوەرناگیرێتو وا پێویست دەکات کەمتر قسە بکات, چونکە لەکۆمەڵگای کوردیدا ئەگەر کچێك زۆر قسەبکاتو گفتوگۆ لەگەڵ دەوروبەربکات پێی دەوترێت زۆر بلێیە یان بەمانایەکی تر دەوترێت (چەنەبازە، دەمەوەرە) بەمشێوەیە ناودەبرێت, یاخود پەندی کوردەواریی کە دەوترێت کچی شەرمن شارێك دێنێت ئەمەش کاریگەریی دەبێ لەسەر کەسێتی.

کەواتە کەسێتی ژن پەیوەندیی هەیە بەو رەوشتەی ئاین فێرمانی کردووەو خێزانو کۆمەڵ نرخی ئەدەنێ بەسەر کەسێتی کچدا چەسپیوەو وایکردووە کەسێتی شەرمن رەنگدانەوەی هەبێ لەژیانیداو دەبێتەهۆی کۆنترۆڵکردنو دانانی سنورێك بۆ بیروبۆچوونەکانیو ناتوانێ گەشە بەکەسێتی خۆی بدات, یاخود ئەو کچەی لەتەمەنی منداڵیداو هەرزەکاریدا خەتەنەدەکرێت وا تێدەگەیەنرێت کە پرۆسەیەکی راستەو لەبەر دابونەریتو ئاینو لەبەرژەوەندیی ئەوو خێزانەکەیدایە، کە ئەمەش کاریگەریی لەسەر کەسێتی دەبێت بەوەی هۆکارێکە کە کچەکە دەستدەکات بەفێربوونی شاردنەوەی هەڵچوونە راستەقینەو ئازاراوییەکانی, ئەم شاردنەوەیە

پەرەدەسێنێت تاكو فێری درۆكردنو نواندن دەبێتو دانپێدانەكانی بەوەی كە خەتەنەكردن بەعەیب دەزانێت, كە ئەمانەش بەدرێژایی قۆناغی تەمەنی رەنگدانەوەی سلبی لەسەر كەسێتی ژن دەبێت.

شكاندنەوەی بەردەوامی ئەو كچانەی خەتەنەكراون لەلایەن خێزانو دەوروبەرەوە بەهۆی ئەوەی خەتەنەنەكراوە ئاوی دەستی حەرامە بۆتەهۆی دروستبوونی گرێی دەروونیی, لەخۆشیو هەستكردنو شادی لەچێژی سێكسی ئەو مافی سروشتی پێبەخشیوینو پارچەیەك پێست دەتوانرێت زیاتری بكات خوا لەناخماندا خولقاندویەتی، كەواتە بۆچی كچەكانمان هەر لەتەمەنی منالییەوە جوانترین ساتەكانی تەمەنیان لێدەشێوێنین لەرێگەی خوێنرێژییەكی زۆرەوە)[]‌.

لەلایەنی دەروونییەوە دەبینین خەتەنەكردن دەستدرێژیكردنەسەرێكی ئاشكرایەو بەتوندوتیژیی دژی ژنان دادەنرێت بۆ قەوارەی ئەندامی دەروونیی كچ كە لەژێر ناوی نەریتوكلتوردا جێبەجێدەكرێت, هەرچەندە كە تەمەنی كچ منالّ بێت كە لەتەمەنی (2-10) سالّیداو زیاتردا خەتەنەدەكرێت دەتوانرێت بەراوردبكات لەنێوان ئەو بەرتیلە ماددییە بێ نرخانەی كە پێی بەخشراوە بەكرینی بووكەشووشەو جلوبەرگی تازە ئەوەی كە خۆی لەشكۆمەندیی و تەندروستی خۆی بەخشیویەتی, ئەمەش دەبێتە رێخۆشكەرێك بۆ نەمانی متمانەو بروا بەكەسانی تر بەتایبەتی ئەوانەی كە خۆشەویسترین كەسن لەلای ئەوانیش دایكوباوكنو ئەم ستەموئازارە لاشەیی و دەروونییە دەبەستێتەوە بەهەست بەتاوانو دوودلّیی و شەرمەزاریی دەكات كە بەدرێژایی ژیانی پێوەی ئەنالێنێ, بەهۆی بەلەتوپەتكردنی لەشیانو برینی پارچەیەك لەگیانیان, بێگومان خەتەنەكردنی كچان بەهۆی ئەو هەموو ئازارەی تووشی دەبێت لەرووی جەستەیی و دەروونییەوە كاریگەریی سلبی هەیە لەسەر كەسێتی و لەقۆناغە جیاجیاكانی تەمەنیدا دەردەكەوێت.

خەتەنەكردن لەسەر كەسێتی ژن ئامرازێكە یان هەولێكە بۆ شكاندنو زەلیلكردنی ژن كە وای لێدەكات هەمیشە هەستبكات ئەو لەژن بەولاوە هیچی تر نییەو لەپیاو كەمترە وەكو پیاو لەئارەزوو غەریزە سروشتییەكانی بێبەشدەبێ, مافی ئەوەی نادرێتێ هەتا سوود لەجەستەی خۆشی وەرگرێت، بەوەی وەك مافی

---

[] **لیلی عەلی. گوناهەكانی ژن بوون و ستەمەكانی جەستە لا** 8

بەرامبەرەکەی ناتوانێ شادمان بێو بەقۆناغی ئۆرجازم بگات, هەموو کیانی سنووری هەیە کە پیاو بۆی داناوە, کە زاڵێتی عەقڵییەتی پیاو لەدارشتنی کەسێتی ژن لەقۆناغەکانی تەمەنیدا کاریگەریی سلبی بەجێدەهێڵێت.

لەکاتی خەتەنەکردنی کچێکدا ژنان لەناو خۆیاندا هەندێك رستەی زۆر بێمانا دەڵێن کە نیشانەی ئەوپەڕی نەزانینە وەك (دەبا ئاگرەکەی دامرکێتەوە) یان (با بەسوێری نەمێنێتەوە) یان ( تۆزێك هێوربێتەوە)و دوای هەموو رستەیەك لەو رستانە پێکەنینێکی هستریانە دەستپێدەکات وەك نیشانەی رازیبوونو شادی کە هەموو ئەوانەی دانیشتون لەژنەکان هەمان شتیان بەسەرهاتووە کە بەسەر کچەکەدا دێت، لێرەدا ئەمە مایەی ئاگادارییە وەك د. خمیس دەڵێت (چونکە کاردانەوەی ژنێکە کە ئینکاری لەنەهامەتییەکانی دەکاتو لەپشت زمانێکی درێژەوە خۆی شاردۆتەوە بۆئەوەی مەسەلە بنەڕەتییەکە ونبکات), تەنیا کچەکەیە لەدوایدا بەتەنیایی دەمێنێتەوەو ساردیی‌و تەنیایی رووی تێدەکاتو فرمێسکی پرسیار دەرێژێو دەڵێ بۆچی وام بەسەرهات؟ من چ هەڵەیەکم کرد؟ ئەو نازانێ تەنیا هەڵەی گەورەی ئەوەیە کە خوا بەکچ خولقاندویەتی[24])

پرۆسەی خەتەنەکردن مامان (مێینە)یە یەکەم کەسە ئەم کارە ئەنجامدەدات، کچەکە لەلایەن دایکییەوە دەخرێتە چنگی مامانەوە لەم کاتەدا پورو ئامۆژن یان ژنە دراوسێ هەڵدەستن بەدەمکوتکردنو پەکخستنەوەی قاچەکان تاکو توانای بەرەنگاربوونەوەو هیچ جوڵەیەك نەکات، ئەم بەشدارییەی ژنان بەمشێوەیە دەبێتەهۆیەك کە کچەکە ئارەزووی تۆڵەکردنەوەی لادروستبێت بەرامبەر ئەو کەس‌وکارەی کە ناپاکییان بەرامبەر کردووەو لێرەدا دایك کەسێتییەکی شەڕانگێزانە بەرامبەر کچەکەی کە مێینەیە دەنوێنێت کە بەهۆی داب‌ونەریتی باوی کۆمەڵایەتی دەسەپێنێت بەسەریدا, کەواتە خەتەنەکردن کەسێتی ژن ملکەچی سیستمی کۆمەڵایەتی دەکات بۆ پاراستنی ئەو داب‌ونەریتو کلتورەی کە زیانبەخشە لەکۆمەڵگادا.

پرۆسەی خەتەنەکردن وەك پرۆسەو لابردنی میتکە لەئەندامی زاوزێی ئەو کچە کاریگەریی خراپ لەسەر دەروونی بەجێدێڵێت، هەست بەستەم لێکردنو گۆشەگیریی‌و شەرمکردن دەکات لەو کارەی کە بەسەری

---

[24] **لیلی علی.گوناهەکانی ژن بوون و ستەمەکانی جەستەلا**10-12

هاتووەو جۆرەها کێشەی کۆمەڵایەتی دروستدەکەنو رەنگدانەوەی لەسەر کەسێتیو ژیانی بەگشتی دەبێت ئەمانەش وا دەکەن کەسێتییەکی لاوازو شەرمن رەنگبداتەوە لەژیانیدا, بۆیە ماوەتەوە بڵێین دابڕانی ژن لەبەشداریکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی رەفتارێکی وای دروستکردووە کە مێینەیی سەرەداوی خۆپەرستیو بالادەستیو دژواریی دروستبکات[]

بەڵام ئەگەر ژنێك لەقۆناغەکانی تەمەنیدا کاری لەسەر لایەنی وشیاریی عەقڵیو کەسێتی خۆی کردبێتو ژینگە کۆمەڵایەتییەکەشی هەلی گونجاوو زەمینەی بۆ رەخسانبێت ئەوا کەسێتی ژن بەهێزتردەبێتو سەرنجراکێشتردەبێ، ئەتوانێت بازنە داخراوەکانی کۆمەڵگەو چەوساندنەوەو زاڵبوونی دەسەڵاتی پیاوسالاریی قبوڵ نەکات.

ماوەتەوە بڵێین, کەسێتی ساغ بەئارامیی دژایەتی ئەو داب‌ونەریتە رواڵەتیانە دەکات کە بۆ زۆرکەس جێگای بایەخنو زۆر بەئاسانی یاسا پڕ زەقوبرقو بێ ماناکان پشتگوێدەخات, کەسێکە پشتبەستو بەخۆیو تەنانەت ئامادەنییە بەبێ هەڵسەنگاندن پێودانگە کلتورییەکان قبوڵبکات, بێگومان بەو مانایە نییە لاسارانە لەبەرامبەر بەها کلتورییەکان دەوەستێتەوە, بەڵکو لەرێگەی دەنگی دەروونییەوە ئاگاداردەکرێتەوە چ کاتێك بەشێوەیەکی ژیرانەو شارەزایانە دژایەتی بکات[] .

### خەتەنە وەك توندوتیژیی دژ بەکەسێتی ژن :

توندوتیژیی ئەگەرچی جۆری زۆرەو هەریەك لەوانە کاریگەریی خراپی دەبێ لەسەر کەسێتی ژن لەرێگەیەوە دەتوانرێت هەموو ژیانی بکاتە دۆزەخو هەریەك لەجۆرەکانی توندوتیژیی کاریگەریی گەورەی هەیە لەسەر دارشتنی بناغەی کەسێتی ژن.

یەکێك لەشێوازەکانی توندوتیژیی جەستەیی بریتییە لەخەتەنەکردنی ژنان.

---

[] **هەمان سەرچاوەی پێشوولا62**

[] **واین دایر،وەرگێڕانی لەفارسیەوە ناسرسەلاحی ، هەست بەگەورەیی خۆت بکە((دەروونزانی))چاپی سێهەم لا91**

خەتەنەکردن بەمانای لێکردنەوەی بەشێکی گرنگی کۆئەندامی زاوزێی ژن دێت ئەویش بەمەبەستی خەساندنی بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە، کە تیایدا ژنان بەتەنها زەرەری جەستەیی و سێکسییان لێناکەوێ، بەڵکو باری دەرونیشییان زۆر دەشڵەژێ و ئاسەواری خراپی لێجێدەمێنێ کە کاردەکاتە سەر هەستوبیرکردنەوەی کچەکە بەجۆرێك لەداهاتوودا بەتەواوی کەسێکی دورەپەرێزو نادروستی لێدەردەچێت[27].

ئەم جۆرە توندوتیژییە بەهۆی برینی ئەندامی دەرەوەی زاوزێی ئەو بەشە گرنگەی کە دەبێتەهۆی وروژاندنی سێکس، ڕووبەڕووی کێشەی کۆمەڵایەتیو دەروونیی دەبێتەوە لەقۆناغەکانی ژیانیدا، بەهۆی ئازاری زۆرو ترسودڵەڕاوکێوە, لەبەربوونی ئازارێکی زۆر لەو ناوچەیەداو لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری لێبڕاوە، ئەمەش ساردیی سێکس دروستدەکات لەئەنجامی ئەوەی هەندێ شوێنی هەستیار وەك میتکە کە ئەندامێکی زۆر گرنگە لەکرداری سێکسدا بەتایبەتی لەقۆناغی یەکەمی کرداری سێکسدا کە پێی ئەوترێت قۆناغی وروژاندن سەرەڕای ئەوەی کە ئافرەت بەسروشتی خۆی لەسەرخۆیە لە قۆناغی وروژاندندا, بەڵام خەتەنەکردن زیاتر ژن لەم قۆناغەدا دوادەخاتو لەوانەیە هەر نەوروژێت, ئەمەش بەجۆرێکی توندوتیژیی دابنێین کە دەبێتەهۆی توندوتیژیی کۆمەڵایەتیو سێکسی، هەربۆیە بەئاشکرا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسلمێ کە زۆر دەگمەنە مومارەسەی جنس لەنێوان ژنومێردەکاندا مومارەسەیەکی ئاسایی بێ, بۆیە ژنان دەکەونە بەرشاڵاوی لێدان بەهۆی ساردیی لەکرداری سێکسدا، ئەمە جگەلەوەی بەهۆی کەمیی یان نەبوونی ڕۆشنبیریی سێکسی لەنێوان ژنوپیاودا کە گەورەترین کێشەی کۆمەڵایەتیو دەروونیی دروستدەکات بەبێ ئەوەی درك بەوە بکرێت کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساردی لەسێکسدا دەبێتەهۆی تێکچوونی باری هاوسەریی نێوان ژنومێرد، بەو پێیە لەوانەیە ببێتەهۆی جیابوونەوە یاخود هێنانی ژنی دووەم کە ئەمەش زیانەکانی دەگەڕێتەوە بۆ هەردووکیان, هەربۆیە لێرەوە توندوتیژیی دەروونیی لەگەڵ بیرکردنەوەی کچو بوونی توندوتیژیی کۆمەڵایەتیدا پەیدادەبێت, کچەکە لەکاتی خەتەنەکردندا تووشی باری دەروونیی ناهەموار دەبێتو لەوانەیە کارێکی زۆر

---

[27] **پەیمان عزالدین .گۆڤاری هزر 1999ژمارە** 2 **لا** 15

بكاتە سەر باری دەروونیی كە كاری لەسەر زیانی جەستەیی دەبێت, ژنان بەهۆی سەركوتكردنو شەرمەوە هەر لەمنداڵییەوە خەتەنەدەكرێنو كە گەورەش دەبن پێیانوایە شەرمەو عەیبەو ناتوانن بۆ دەوروبەریانی دەربڕن.

د.فریال عەبدولقادر لەتوێژینەوەیەكی زانستیو مەیدانیی باس لەوە دەكات كە سێ جۆر توندوتیژیی دژ بەژنان لەلایەن پیاوان كە لەمافو ئەركو كاركردندا یەكسانن دەكرێو كاریگەریی خراپیان هەیە لەسەر كەسێتی ژن, ئەوانیش (خەتەنەكردنو شووكردنی پێش وەختی تەمەنی یاسایی‌و لێدانو ئازاردانی جەستەی ژن لەلایەن خێزان یا هاوسەرەوە)و تیشكی خستۆتە سەرئەوەی كە یەكێك لەگرنگترین ئەو مەسەلانەی كە رای گشتی كاری بۆ بكات خەتەنەكردنی كچانە كە سەرچاوەكەی پەیوەستە بەداب‌ونەریتی میسرییە كۆنەكانو بۆتەهۆی ئەوەی كچان تووشی شۆك بن!!![28].

بۆیە گرنگە ئێستا كاربكرێت بۆئەوەی ئەم جۆرە توندوتیژییە (خەتەنەكردن) لەسەر ژن لابرێت كە رۆژانە لەهەموو شوێنێكی ئەم كۆمەڵگایەی ئێمەدا دووبارەو چەندین بارەدەبێتەوەو پێویستە ژنان بێدەنگ نەبنو بەشداریی چالاكیان هەبێت بەشێوەیەكی فراوان لەم راستییەی كە خەتەنە سێ شێوازی توندوتیژیی لەخۆدەگرێت كە ئەوانیش (دەروونیی، جەستەیی، سێكسی)یەو بەرچاوڕوونی تاكەكانی كۆمەڵ بەتایبەت ژنان كە كەسێتی بەشێوەی بەرنامەیەك نەبێ لەچوارچێوەی كلتورو داب‌ونەریتەوە وەرگیراوبێتو ژنان ببنە جێبەجێكاری ئەو بەرنامەیە.

---

[28] المراة والطفل-انواع العنف الثلاثة ضد المراة لا10

# بەشی یەکەم

## تەوەری پێنجەم- کاریگەرییەکانی خەتەنەکردن

## زیانە کتوپڕەکان

## خوێن بەربوون- هەوکردن و سوتانەوە- پیسبوون- گرفتی میزکردن.

## زیانەکان لەداهاتوودا

## تێکچونی دەرونی و سێکس

## تەوەری پێنجەم/ کاریگەرییەکانی خەتەنەکردن

### یەکەم/ زیانە کتوپڕەکان:-[29]

ئازار: ئەم پرۆسەیە لەزۆربەی بارەکاندا بەبێ بەکارهێنانی سڕکەر ئەنجامدەدرێت لەبەرئەوە منداڵەکە ئازارێکی زۆرو کتوپڕ دەچێژێت لەوانەیە چەندەها رۆژ بەردەوامبێتو دوای ئەوە بەرەو کەمبوون بڕوات.

خوێن بەربوون کە لەترسناکترین ماکەکانی ئەم کردارەیە, ئەمەش یان خوێن بەربونێکی کەمەو بەرێگە باوەکان بێ پەنابردنە بەر چارەسەری پزیشکی چارەسەر دەکرێت, ئەمەش رێخۆشکەردەبێت بۆ روودانی هەوکردن, لەم رێگانەش بەکارهێنانی خۆڵەمێش یان گیراوەی شیر یان لەهەندێك باردا چەند جۆرە گژوگیایەکی کرژکەر وەك (القرض) بەهەموو تەپوتۆزێکی سەریەوە یان خۆڵەمێش بەکاردێت, لەهەندێك باردا خوێن بەربوون زۆر دەبێت لەئەنجامی بڕینی خوێنبەرێکی گەورە لەکاتی خەتەنەکردنەکەداو ئەمەش دەبێتەهۆی گواستنەوەی کچەکە بۆ نەخۆشخانەو دەمودەست نەشتەرگەریی بۆ دەکرێت, سەرەڕای ئەو هەموو ترسناکییەی لەوانەیە پێویستی بەخوێن تێکردنیش هەبێتو هەندێجار چەند بارێکی نەخۆشی خوێن لەو کەسەدا هەیەو کە تاکاتی خەتەنەکردنەکە دەرناکەوێتو لەو بارانەدا کە هەوڵی خەتەنەکەر یان کەس‌وکارەکەی بۆ وەستانەوەی خوێن بەربوونەکە بەرێگە باوەکان سەرناگرێت لەوانەیە چەندەها جاریتر ئەم خوێن بەربوونە دووبارەببێتەوەو ئەم جۆرەش ناودەبرێت بەخوێن بەربوونی دووەمی کە چارەسەری گرانترەو ترسی زیاترە.

تاسانی دەروونیی فۆبیا لەئەنجامی زۆری ئازار یان لەئەنجامی خوێن بەربووندا.

کەمیی روودانی پیتاندن کە هەندێجار دەبێتەهۆی نەزۆکیی، منداڵ نەبوون لەژناندا[30].

روودانی هەوکردنو سوتانەوە لەئەنجامی پیسبووندا, چونکە ئەم کردارە بەبێ پاکردنەوەی ناوچەی مەبەست بەبێ پاکژکردنەوەی ئامێرە بەکارهاتووەکان, هەروەها بەبێ پاککردنەوەی دەستی خەتەنەکەرو ئەو شوێنەش کە کردارەکەی تیادا روودەدات، ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی هەوکردنی ناوچەیی کە دەبێتەهۆی درەنگ

---

[29] ختان الأناث و البتر التناسلي للاناث ( ww.arabmedmag.com FGM )

[30] مهند صلاحات، ختان الاناث ....بين العلم والدين لا4الانترنيت

ساڕێژبوونەوەی برینەکەو لەوانەیە هەوکردنەکە بگاتە بەشەکانی ناوەوەی کۆئەندامی زاوزێ، واتە بگاتە ناو زێو منداڵدانو بۆرییەکانی منداڵدان یان لەوانەیە بگاتە کۆئەندامی میز، وەك میزەڵدانو گورچیلەکان یان لەوانەیە ئەم هەوکردنە ژەنگاوی بێت لەئەنجامی تووشبوون بەمیکرۆبی گەزاز بەتایبەتی لەناوچەی دێنشینو میللییەکاندا, چەندەها لێکۆڵینەوەی تازە کە لەووڵاتە ئەفریقییەکاندا ئەنجامدراون ئەوە ڕووندەکەنەوە کە تووشبوون بەنەمانی بەرگریی وەرگیراو (ئایدز) لەوانەیە لەئەنجامی پیسبوونی برینی خەتەنە لەژناندا ڕوویدات.

تێکچوونی میزکردن، ئەمەش زۆرجار بەشێوەی میزگیران لەئەنجامی ترسان لەئازار دەردەکەوێت, هەروەها سوتانەوە لەکاتی میزکردندا لەئەنجامی تووشبوونی دەرچەی میز یان بۆری میز لەکاتی خەتەنەکردنەکەدا بەتایبەتی ئەگەر خەتەنەکەر شارەزایی لەتوێکاری سروشتی بەشەکانی دەرەوەی کۆئەندامی زاوزێدا نەبێت, لەئەنجامی ئەمەشدا میزگیران یان (سلس)ی میز یان میز بەخۆداکردن لەهەندێ باردا ڕوودەدات.

شێواندنی دەرەکیی، کە برینەکە بەشانەیەکی ریشاڵی دەوردەدرێت کە شێواندنێك لەناوچەکەدا دروستدەکات، هەروەها جێبرینی بەئازار لەئەنجامی هەوکردندا دروستدەبێت, یان هەندێجار شێواندن لەئەنجامی لێنەکردنەوەی بەشی یەکسان لەهەردوو لای ناوچەکەدا دروستدەبێت یان لەئەنجامی بەجێهێشتنی زیادەی پێست کە گەشەدەکاتو شۆڕدەبێتەوە, ئەمەش دەبێتەهۆی دووبارەکردنەوەی کردارەکە لەکاتێکی نزیکدا, هەندێجار چەند گرێیەك لەشوێنی برینەکەدا لەناوچەی میتکەدا دروستدەبێت لەئەنجامی چوونەژوورەوەی خانەکانی پێست بۆ چەند ناوچەیەکی ژێر پێست لەکاتی ساڕێژبوونو یەکگرتنەوەی برینەکەداو ئەم گرێیانە ناوچەکە ناشیرین دەکەنو بەتێپەڕبوونی کات قەبارەیان گەورەدەبێتو پێویستیان بەنەشتەرگەریی دەبێت بۆ لابردنیان.

مردن، لەهەندێ باردا مردن لەئەنجامی خەتەنەکردنەوە ڕوودەداتو ناتوانرێت ژمارەی مردووەکانی ئەم پرۆسەیە بخەملێنرێت لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر کەم لەم بارانە دەگەیەنرێتە نەخۆشخانەو زۆرجار وەك قوربانیی خەتەنەکردن تۆمارناکرێت لەترسی کێشە یاسایەکانو بۆپاراستنی خەتەنەکەر یان بەخێو کەر.

**دووەم/ زیانەکانی لەداهاتوودا:-**[31]

ئازار لەکاتی سووڕی مانگانەدا لەوانەیە هاتنەخوارەوەی خوێن لەزێوە ببەسترێتەوە بەو ئازارانەی کە لەڕابردوودا لەکاتی خەتەنەکردندا روویداوە، هۆکاری ئەمەش لەوانەیە ئەندامی بێت لەئەنجامی هەوکردنی درێژخایەنو خوێن تێزان لەناوچەی حەوزدا.

بێگومان خەتەنەکردنی کچان بەجۆرێك لەسنور بەزاندنو شێواندنی کۆئەندانی زاوزێ دادەنرێت کە فرمانی تایبەتی خۆی هەیە ئەنجامی ئەمەش بەیەکەوەنووسانی هەردوو لچەکانە، ئەمەش دەبێت بەهۆی گرانیی پەیوەندی سێکسی یان لێنۆڕینی زێ, هەروەها ناڕەحەتی لەکاتی منالْبووندا.

درێژخایەنیو گرانیی کرداری منداڵبوون بەتایبەتی لەقۆناغی دووەمی قۆناغەکانی منداڵبووندا, چونکە لەوانەیە ئەندامەکە سیفەتی لاستیکی نەمێنێت لەئەنجامی بەیەکەوەنووسانی برینی خەتەنەکە بەهۆی شانەیەکی ریشاڵی، ئەگەر دەرچەکە لەکاتی گونجاودا نەکشێت ئەبێت بەهۆی دڕانی ناوچەی (العجان)و لەوانەیە بگاتە ناوچەی کۆمو لەم کاتەدا ژن ناتوانێت کۆنترۆڵی پیسایی بکات (دڕاندنی بەشی دواوە)و درێژخایەندنی ماوەی منداڵبوون ئەبێت بەهۆی دڕاندنی شانەی چواردەوری دەرچەی میز (دڕاندنی بەشی پێشەوە) کە خوێن بەربوونێکی زۆری لەگەڵ دەبێت، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسەی یارمەتی منداڵبوونەکە دەدات شارەزایی تەواوی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەم حاڵەتانە نەبێت، ئەم دڕاندنانە لەدواوەو پێشەوە پێویستی بەنەشتەرگەریی دەبێت، بۆئەوەی چاکبکرێتەوەو دایکەکە تووشی خوێن بەربوون نەبێت، هەروەها گرانیی منداڵبوون دەبێتەهۆی خاوبوونەوەی ماسولکەکەی، (العجان) یان دڕاندنی کە لەئەنجامدا دابەزینی منداڵدانو میزەڵدانی بەدواوەدەبێت.

گرانیی منداڵبوون دەبێت بەهۆی مردنی منداڵەکە لەکاتی لەدایکبووندا یان دەبێت بەهۆی بوونی منداڵی کەم ئەقڵ لەئەنجامی ئەو پەستانە زۆرەی کە دەکەوێتە سەر سەری منداڵەکە بەهۆی دووروودرێژی ماوەی لەدایکبوونەکە یان بەهۆی دەستتێوەردانی ئامێری بۆ دەرهێنانی منالەکە.

هەموو ئەو کاریگەرییانەی کە باسکران بەشێوەیەکی ئاشکرا لەپاکیزەیی فیرعەونیدا دەردەکەوێت.

بێگومان بەجێهێنانی پرۆسەی خەتەنەکردن بەڕێگەیەکی نامرۆڤانە بەسەر مێینەداو لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی کە تووشی کۆئەندامی زاوزێ دەبێت، لەم پرۆسەیەدا کاریگەریی ترسناکی هەیە بۆ سەر ئەم

---

[31] ختان الاناث و البتر التناسلي للاناث ( ww.arabmedmag.com FGM )

کۆئەندامەو فرمانەکانیشی، لەم کاریگەرییانەش دووبارەبوونەوەی تاسانی دەروونیی لەشەوی پەردەدا، کە لەئەنجامی ترسی زۆر لەنزیکبوونەوە لەو شوێنە دەبێت بەهۆی گران دڕاندنی پەردەی کچێنییەوە لەهەندێ باری تردا دڕاندنی پەردەکە دەبێت بەهۆی خوێن بەربوونێکی زۆر لەئەنجامی هاتنەوەیەکی برینەکە بەشانەیەکی ریشاڵی کە دەبێتەهۆی گواستنەوەی بووکەکە بۆ نەخۆشخانە بۆ ئەوەی دەمودەست نەشتەرگەریی بۆ بکرێت بۆ چارەسەری دڕاندنکە.

لەماوەی یەکەمی ژیانی هاوسەریدا هەندێ لەژنان لەکاتی جوتبووندا هەست بەئازار دەکەن لەئەنجامی تەسکی دەرچەی زێدا, هەروەها بوونی جێبڕینو بەیەکەوەنووسانی ئازاربەخش لەو ناوچەیەدا هۆکارێك دەبێت بۆ رەتکردنەوەی کرداری سێکسی یان بەجێهێنانی سێکس لەشوێنی ناسروشتییەوە.

کاریگەرییە دەرونییەکانی خەتەنەکردن، دەبینین کە خەتەنەکردن دەستدرێژکردنە سەرێکی ئاشکرایە بۆ قەوارەی ئەندامیو دەروونیی کچ کە لەژێر ناوی نەریتو کلتوردا جێبەجێدەکرێت, ئەم پرۆسەیە کاریگەریی خراپی دەروونیی بەجێدەهێڵێت، لەکاتێکدا کە کچ دەکەوێتە چنگی ئەو کەسەی کە دەیباتە لای خەتەنەکەرەکە هەست بەترسو تۆقین دەکات, هەروەها هەست بەئازارێکی لەڕادەبەدەر دەکات لەکاتی خەتەنەکردنەکەدا بەهۆی بەکارنەهێنانی ماددەی سڕکەرەوەو لەپاشاندا هەست بەستەملێکردنو گۆشەگیرییو شەرمکردن دەکات لەوکارەی کە بەسەر ئەو ناوچە هەستیارەی لەشیدا هاتووەو ئارەزووی تۆڵەکردنەوەی لادروستدەبێت بەرامبەر بەو کەسوکارەی کە ناپاکییان لێکردووە, ئەمەش لەشێوەی میز بەخۆداکردنی شەوانو وەرنەگرتنو بەگوێنەکردنی ئامۆژگارییو رونکردنەوەی خێزانەکەی دەردەکەوێتو ئەو ژنانەی ئەم کارەیان بۆ ئەنجام نەدرێت بەکەم سەیردەکرێن لەلایەن هەندێ کۆمەڵگەوە, هەرچەندە تەمەنی کچ منالْ بێت خەتەنەکردنی دەبێتە رێخۆشکەرێك بۆ نەمانی بڕوا بەکەسانی تر بەتایبەتی ئەوانەی کە خۆشەویسترین کەسن لەلای ئەوانیش دایكوباوکن [32].

لەلایەنی ئابورییەوە دەبینین کە پرۆسەی خەتەنەکردن قورساییەك دەخاتە سەر داهاتی خێزانو خزمەتە تەندروستییەکانی دەوڵەت لەکاتێکدا کە کچان یان ژنان پەنا دەبەنە بەر نەخۆشخانە گشتییەکانو دامەزراوە تەندروستییەکانی تر بۆ چارەسەرکردن وەك لەحاڵەتی خوێن بەربوونی راستەوخۆی دوای پرۆسەکە.

---

[32] ختان الأناث و البتر التناسلي للاناث ( ww.arabmedmag.com FGM )

ئەوەی کە گومانی لێناکرێت کە ساردیی سێکسی بەشێوە جیاوازەکانییەوە لەلاوازی وەڵامدانەوەی سێکسی یان حەزنەکردن لەکاری سێکسی بێ چەندوچوون لەئەنجامی لێکردنەوەی بەشە گرنگەکانەوەیە کە رۆڵێکی سەرەکییو کاریگەریان هەیە لەکاتی پەیوەندیی سێکسیدا، وەك دەرکەوتووە یەکێك لەهۆکارەکانی ساردبوونی سێکس بریتییە لەخەتەنەکردن (پاکیزەیی) کچان، بەلابردنی میتکە هەمووی یان بەشێکی, کە دەبێتەهۆی ترس لەکرداری سێکس یان قێزکردنەوە یان نەزانین لەئەنجامی پەروەردەکردنی هەڵە[33] , لەبەرئەوە ژنەکە تووشی گیروگرفتی زۆردەبێت وەك خوێن تێزانی ناوچەی حەوزو دەرکەوتنی دەردراوی زێ سەرەڕای شلەژانی دەمارییو دەروونیی کە دەبێتەهۆی ساردبوونەوەی سێکسی، پەیدابوونی ئازار لای ژنەکە لەکاتی جووتبووندا و کەمبوونەوەی هەستو ئارەزووی سێکس لای ژنو نەگەیشتن بەچێژی سێکسی نێوان هاوسەرەکان.

مهراد تسفانج لەکۆنگرەیەکدا بۆ خەتەنەکردنی مێ کە لەجنێف ساڵی 1977 بەستراوە دەڵێت: لە ٪90-95 ئەو ژنانەی خەتەنەکراون تووشی ساردی سێکسی دەبن لەداهاتوودا بەتایبەتی کە لەتەمەنی منداڵیدا خەتەنەکراونو هیچ چێژێکی سێکسی نەبینیوە پێش خەتەنەکردن[34] .

هەروەك د.عەبدولهادی مصباح دەڵێت: یەکێك لەو هۆکارە ئەندامێتییەی کە دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی کرداری سێکس بریتییە لەخەتەنەکردنی کچان بەلابردنی ئەندامە هەستیارەکانو ئەو دەمارانەی کە ئەبێتەهۆی دروستبوونی چێژوەرگرتن لەکاتی ئەنجامدانی کاری سێکسی لای ژنان وەکو (میتکە)[35] .

لەبەرئەمانە پێویستە رۆشنبیریی تەندروستی تەواو ئاراستەی هەموو ژنومێردەکان بکرێت بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتانەداو ناساندنیان بە ناوچە جێگرەوەکانی چێژ, ئەمەش لەڕێگەی پەروەردەی سێکسیو پەروەردەی خێزانییەوە دەبێت، ئەوەی کە پەیوەندیی بەنەوەی داهاتووەوە هەیە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتەدا بنبڕکردنی ئەم پرۆسە زیانبەخشەیە.

---

33 عايدة احمد الرواجية ،البرودوالضعف الجنسي علاجه بالطب العربي والحديث لا127

34 Zwangiles mutilations sexualize feminist, P 25

35 د.عبدالهادى مصباح،ضعف الثقافة الجنسية ،سرشقاء الزوجين،الدارالمصرية اللبنانية. لا 49